## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد؟، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامد، سوارەی ئێلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، محەرەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، ئیسماعیل بێشکچی، عەبدول خالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریان، ئەمین فەیزی بەگ، کامەران موکری، جەلال تەقی




## نەبەز بابان



*ساڵی 1973 لە بەغدا لە دایکبووە

*دەرچووی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدایە 1996

*دەرچووی ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی بەغدایە 1999

*ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی عێراقە.

*ئەندامی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستانە.

*پێشانگەی تایبەت لە هۆڵی پەیمانگەی هونەرەجوانەکان/ بەغدا 1996

*بەشداریکردن لە پێشانگەکانی بەغدا و سلێمانی.

*مامۆستای شێوەکارە لە کۆلێژی هونەر/ زانکۆی سلێمانی

## ژمارەی داهاتوو تایبەتە بە (شاکر فەتاح)


سەرپەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری ڕۆڤار

دڵشاد عەبدوڵڵا

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاجی کۆمپیوتەری

یادگار ئەوڕەحمان

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوومانگ جارێک دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی- فولکەی یەکگرتن-

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار

Tel: 3120690

لە دەرەوەی کوردستان

Tel: 00441628477660

Fax: 00441628486008

E-mail

Info@www.sardam.net



چاپخانەی (شڤان)

# ژیان و بەرهەمەکانی عەلی ئەشرەف دەروێشیان



عەلی ئەشرەف دەروێشیان ساڵی 1920 ی هەتاوی (1941)ی زاینی لە خێزانێکی هەژارو چەوساوەی گەڕەکی عەلاقەبەندەکانی شاری کرماشان هاتووەتە دنیاوە. لەبەر هەژاری خێزانەکەی هاوکات لەگەڵ چونە قوتابخانە واتە لە تەمەنی شەش ساڵییەوە بوە بە شاگردی تەنەکەچی و دواتریش تاوەکو قۆناغەکانی تری خوێندنی تەواوکردوەو بوە بە مامۆستا چەندین کاری جۆراوجۆریکردوە. ماوەیەك شاگردی باوکی بوە گەرچی وەستا سەیفوڵای باوکی پیاوێکی نەخوێنەوار بووەو حەزی نەکردوە منالەکانی بخوێنن. بەڵام زۆربەی شیعرەکانی بابا تاهیر و حافزی لەبەربووەو هەمیشە بۆ منالەکانی خوێندۆتەوە. بەهۆی هەژاری و نەبوونییەوە ساڵی جارێك ماڵەکەیان لەگەڕەکێکەوە باردەکات بۆ گەڕەکێکی تر.

ژیانی ڕۆژانەی نووسەرو خێزانەکەی بەڕوونی لە هەردوو کۆمەڵە چیرۆکی "لەم هەرێمەدا" و "ئابشوران" دادەرکەوتوون باوکی دەروێشیان هەمیشە لەدەست خاوەن قەرزەکانی هەڵدێت و هیچ ڕێگاچارەیەکی نابێت جگە لەوەی لەم گەڕەکەوە باربکات بۆ ئەو گەڕەك تا دواجار خاوەن قەرزەکان شکاتی لێدەکەن و ڕەوانەی زیندان دەکرێت. عەلی ئەشرەف بۆ ئەوەی حەقی خاوەن قەرزەکان بداتەوە و باوکی ئازادبکات دەچێتە ژێرباری قورسی چەندین کاری ناخۆش و دژوار. بەلام بێسوود دەبێت و خاوەن قەرزەکان ناچاری دەکەن بارەتلیاك ببات بۆ ڕەشت و مازندەران و لەوێوە بڵاویکاتەوە بەشارەکانیترداو بۆیان بفرۆشێت. باوکی لەدوای ئازادبوونی لە بەندیخانە لە بەر بێکاری و قەرزاری ڕوودەکاتە شیراز و بۆ هەمیشە ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کرماشان و دواجار لە غوربەتدا و لە شاری کەرەج بۆ هەمیشە ماڵئاوایی دەکات. عەلی ئەشرەف دەروێشیان خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی ودواناوەندی هەر لە شاری کرماشان تەواو دەکات، بۆماوەی دە ساڵ هاوکات لەگەل خوێندنی زانکۆدا لە دێکانی دەرووبەری کرماشان وەك مامۆستایەك وانە دەڵێتەوە. لە تەمەنی بیست و چوار ساڵییەوە نووسینەکانی خۆی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوکاتەی ئێراندا بڵاودەکاتەوە، هەر لەسەرەتاوە وەك نووسەرێکی سیاسی دەناسرێت و هاوکات لەگەڵ نووسین و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیدا وەك چریکێك لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیتریدا کە چەندین نووسەری دیارو ناسراوی وەك سەمەد بیهرەنگی، خوسرەو گولسرخی، بیهروز دەهقانی، نەسیم خاکسار سەعید سوڵتانپوور، فەرەیدون تنکابنی و... چەندین نووسەری تر بەشداری خەباتی سیاسی ئەو ڕۆژگارەیان کرد. عەلی ئەشرەف دەروێشیان بە ئاشنابوونی بە ڕۆشنبیری گەورەی ئێران جەلال ئالی ئەحمەد و دکتۆر سیمین دانیشوەر، لە زانکۆی تاران و ئاشنایی لەگەڵ سەمەد بیهرەنگی و خوێندنی چوار ساڵ ئەدەبیاتی فارسی ئەزموونێکی باشی بەدەست هێناو دواتریش تاوەکو پلەی ماجستەر لە دەروننناسیدا درێژەی بە خوێندن دا.

لەساڵی 1973 دا یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی خۆی بەناونیشانی لەم هەرێمەدا بەچاپ دەگەیەنێت و پێشوازییەکی زۆرگەرم و شایستەی لێدەکرێت و لەماوەیەکی کەمدا بە تیراژی بیست هەزار دانەیی دەجار چاپ دەکرێتەوە.

ئەم کتێبە لەسەتاسەری ئێراندا بە چاکی خوێندرایەوەو بە جۆرێ دەزگای ساواك و دەسەڵاتدارانی ڕژێمی ئەوکاتەی ئێرانی تووڕەکرد بۆیە دەستگیری دەکەن و ڕەوانەی بەندیخانەی دەکەن. هەر لەو ڕۆژانەدا مۆڵەتی چاپی بەرهەمەکانی ڕادەگرن و بەرهەمەکانی لە گۆڤار و بلاوکراوەکاندا قەدەغە دەکەن، ناچار پەنادەباتە بەرناوی خوازراو. بەشێکی زۆر لە بەرهەمەکانی بەناوی خوازراوی لەتیف تەلخستانی، بیهرۆز کوهساران، عەلی کرمانشاهی، عەلی جان دەروێش، هورمز نیك گو و... چەندین ناوی تر بڵاودەکاتەوە. هەر لەساڵی 1973 دا کتێبی "سەمەد بەئەبەدیەت گەشت" بڵاودەکاتەوەو زۆر بەباشی دەخوێنرێتەوە، بیست و دوو

جار بە تیراژی چەندین هەزاری چاپ دەکرێتەوە. هەر لەهەمان ساڵدا دووکتێبی تر چاپ دەکات بەناونیشانی "هەوری ڕەشی هەزار چاو" و "گوڵ تەڵا و کڵاشەسوور"



دەروێشیان لەگەڵ خانە وادەکەی

هەردووکیان چیرۆك بۆمناڵانن، ئەم دوو کتێبە ناوی عەلی ئەشرەف دەروێشیانی خستە سەرزاری زۆربەی خوێنەرانی ئێران و لەماوەیەکی کەم هەردوو کتێبەکە یەکی شانزە جار بە تیراژی بیست هەزاردانەی بلاوکرانەوە. لە ساڵی 1974 دا کۆمەڵە چیرۆکی (ئایشۆران)ی بە چاپ گەیاند کە زۆربەی چیرۆکەکانی باسی ستەماکاری و زۆرداری دەسەلات دارانی ئەو کاتەی ئێران دەکات و نووسەر لەو کۆمەڵە چیرۆکەدا خۆی گێڕەرەوەی ژیانی هەژاران وچەوساوەکانی کۆمەڵگاکەیەتی و وێنەیەکی واقیعی ژیانی ڕۆژنەی خۆی وکۆمەڵگاکەی پیشاندەدات، ئەم کتێبەش بە تیراژی بیست هەزاردانەی نۆزدە جار چاپدەکرێتەوە هەر لەو ساڵانەدا چیرۆکەکانی وەردەگێردرێتە سەر زمانی ئەڵمانی، فەرەنسی، ئینگلیزی و ڕووسی و نەرویجی وئەرمەنی و چەندین زمانی‌تر.

عەلی ئەشرەف لەو ساڵانەدا زیاتر بایەخ دەدات بە ئەدەبیاتی مناڵان و مێرد مناڵان و چەندین کتێب بە چاپ دەکەیەنێت کۆمەڵە چیرۆکی (چیرۆکەکانی مناڵانی کرماشان) لەو ساڵانەدا چاپ دەکات کە هەڵبژاردەیەکە لەو چیرۆکانەی کە قوتابییەکانی نووسیویانە. هەر لەو ساڵانەدا کتێبی بێستوون چاپ دەکات کە لە شێوەی گۆڤارو وتارو چیرۆك و ڕەخنەو شیعری لە خۆگرتووە. ژمارەی یەکەمی چوار جار چاپدەکرێتەوەو لەدوای دەرچوونی چەند ژمارەیەك مۆڵەتی چاپی لێدەسێنرێتەوە.

هەر لەو ساڵانەدا کە لە ڕاستیدا ساڵانی پڕکاری عەلی ئەشرەف دەروێشیان بووە. سێ کتێب چاپ دەکات لەبارەی ئەدەبیاتی مناڵان و مێرد مناڵانەوە.

هەرسێکیان یەکی سێجار چاپ دەکرێنەوە. ساڵی 1975 وتارەکانی کۆدەکاتەوە لە دووبەرگدا بەچاپی دەگەیەنێ کە ئەو دووبەرگەش و بەرهەمەکانی تری چەندین جار چاپ دەکرێتەوە. ساڵی 1977 هەڵبژاردەیەك لە چیرۆك و وتارەکانی بەناونیشانی "ڕۆژی یەکەمی پشوودان" چاپ دەکات و لەدوای ئەوە یەکی سێ جار بە تیراژی چەند هەزاری چاپ دەکرێتەوەو وەك زۆربەی بەرهەمەکانی تری مۆڵەتی چاپکردنەوەی لێدەسەنرێتەوە. ساڵی 1978 یانزە ژمارەی کتێبی (کتێبی مناڵان و مێردمناڵان) بە چاپ دەگەیەنێت. هەر لەو ساڵەدا دوو کۆمەڵە چیرۆك بەناوینشانی "وەرزی نان" و "لەگەڵ ئاوازەکانی باوکمدا" چاپ دەکات و هەردووکیان یەکی پانزە جار بە تیراژی بیست هەزاردانەی چاپکرانەوە هەر لەو ساڵەدا (کەی ئەگەڕێیتەوە کاکەگیان) چاپ دەکات کە چیرۆکێکی درێژە بۆ مناڵان و مێرد مناڵان و چواردەجار بە تیراژی بیست هەزاردانەی بلاوکراوەتەوە ساڵی 1980 ڕۆمانی (بەندی 18)و کۆمەڵە چیرۆکی (چیرۆکەکانی بەند) بلاودەکاتەوەو دوو چیرۆکی درێژ بۆ منالان و مێرد مناڵان بەناونیشانی (ڕەنگینە) و (ئاگر لە کتێبخانەی مناڵاندا) بە چاپ دەگەیەنێ. لەماوەیەکی کەمدا هەریەکەیان چواردە جار چاپکراون. ڕۆمانی بەندی 18 لەماوەی ساڵێکدا حەوت جار چاپ دەکرێتەوەو پاشان بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵ قەدەغە دەکرێت و مۆڵەتی چاپکردنەوەی نادرێتێ. لەپاش چاپی هەشتەم و نۆیەم لەوڵاتی ئەڵمانیا ساڵی پار مۆڵەتی چاپی درایەو چاپخانەی ئاتنا چاپی دەیەمی خستە بازاڕەوە.

ساڵی 1988 ئەفسانەو مەتەڵە کوردیەکان چاپ دەکات. تاوەکو ئێستا چوار جار چاپ دەکرێتەوە. ساڵی 1993 ڕۆمانی چوار بەرگی (ساڵە هەوریەکان) چاپدەکات ساڵە هەوریەکان گەورەترین شاکاری ئەدەبی عەلی ئەشرەف دەروێشیانە ئەم ڕۆمانە بیرەوەری ژیانی نووسەر خۆیەتی و تاوەکو ئێستا چوار جار چاپکراوەتەوە ساڵی 1994 کۆمەڵە چیرۆکی (قەڵەم قامیش)ی چاپکردوە کە دواهەمین کۆمەڵە چیرۆکی نووسەرە تاوەکو ئێستا سێ جار چاپکراوەتەوە. ڕەخنەگران ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بە ئەزموونێکی نوێ و سەرکەوتوی کاری عەلی ئەشرەف دەروێشیان دەزانن. ساڵی 1998 چوار کتێب چاپ دەکات. فەرهەنگی زاراوەی کرماشانی و هەڵبژاردەیەك لە چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، بیرەوەریەکانی سەفەر خان. چوار جار چاپکراوەتەوە. ئەم کتێبە گفتوگۆیەکی عەلی ئەشرەف

دەروێشیانە لەگەڵ سەفەری قەهرەمانیان. سەفەر خان ناسراوە بە کۆنترین زیندانی جیهان و یەکێك بووە لە لێپرسراوانی حزبی دیموکراتی ئازربایجان بیرەوەریەکانی سەفەرخان مێژوویەکی واقیعی زیندانەکانی ئێرانە. سەفەری قەهرەمانیان بەڕاپەڕینی گەلانی ئێران لە ساڵی 1979 بەیەك ڕۆژ لەگەڵ عەلی ئەشرەف دەروێشیان و چەند نووسەرو خەباتگێڕێکدا ئازاد دەبێت ساڵی 1998 بەرگی یەکەمی (ئەفسانەکانی خەڵکانی ئێران) بە هاوکاری ڕەزاخەندان مهابادی چاپ دەکات. فەرهەنگی ئەفسانەکان پێکهاتوە لە هەژدەبەرگ و تا ئەمڕۆ بە پێزترین و چاکترین سەرچاوەی ئەفسانەکانە لە کتێبخانەی فارسیدا. ساڵی 1999 کتێبخانەی "کتێبی ئەرزان" کۆمەڵە چیرۆکێکی دەروێشیانی بەناونیشانی "شەو ئاوسە" بەچاپ گەیاند. ساڵی 2000 یادی سەمەدی بیهرەنکی چاپ دەکات کە کتێبێکە دەربارەی ژیان و بەرهەمەکانی سەمەدی بیهرەنگییە. ساڵی 2001 بەرگی یەکەم و دووەمی "ئەو چیرۆکانەی خۆشم دەوێن" چاپ دەکات کە پرۆژەیەکی ڕەخنەییە و پێکهاتوە لە هەشت بەرگ بە هاوکاریی ڕەزاخەندان مهابادی. لەم هەشت بەرگەدا لە هەر نووسەرێك چەند چیرۆکێکی هەڵبژاردوەو ڕەخنەی لەسەر نووسیوە و قۆناخ بەندییەکی چیرۆکی هاوچەرخی فارسی کردووە


1971 شاری سەحفەی کوردستان

لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆی ساڵی 2002 هەڵبژاردەیەك لە "وتار، گفتوگۆ ڕەخنە"کانی خۆی بەناوی "چۆن و بۆچی" چاپدەکات. ساڵی 2003 ژمارەی دووەمی "نامەی کانونی نووسەران" لە ژێر چاودێری ئەودا بە چاپ دەگات. چوار کتێبی دەروێشیان چاوەڕوانی مۆڵەتی چاپ دەکەن.

ڕۆمانی "هەمیشە دایك" کۆمەڵە چیرۆکی "چیرۆکە گەرم و تازەکان" دواین چیرۆکەکانی نووسەری لە خۆگرتووە، باوەڕو دابونەریتی خەڵکی کرماشان" "بەهیوای باران" وەرگێڕانی چیرۆکی کوردیەو بەرهەمی بیست چیرۆکنووسی کوردی لە خۆگرتووە. چەند کتێبێکی تریشی ئامادەیەو لە چاپخانەدایە. عەلی ئەشرەف دەروێشیان چەندین ساڵە ئەندامی کانوونی نووسەرانی ئێرانەو بۆ یەکەمجار وەك کوردێك بۆ ماوەی چەند ساڵێك لێپرسراوی گشتی کانوونی نووسەرانی ئێران بووەو ئێستاش ئەندامی فەخری نووسەرانی ئێرانەو لە شاری کەرەج دەژی. دەروێشیان لە دوای ئەوەی کە چەند جارێك دەکرێتە زیندان و ئازاد دەبێت. دواجار بە دەساڵ زیندان مەحکوم دەکرێت و لەدوای شەش ساڵ لەگەڵ ڕاپەڕینی گەلانی ئێران و شکاندنی دەرگای بەندیخانەکان لەگەڵ چەند نووسەرێکدا ئازاد دەبێت.


سیمین بێهبەهانی و دەروێشیان

چیرۆک

# سێ گوێیە زیز



دەنگی وێک کەوتنی دەرگا دارینە ڕزیوەکە، ئەو سێ قشقەڵەیەی لەسەر دیوارە قوڕینەکە هەڵنیشتبوون، هەڵفڕاندن. قاڕەقاڕیان ماڵەکەی پڕکرد، لەسەر بەفری قولینچکی حەوشەکە نیشتنەوەو لە پیرەپیاوەکەوە ڕامان، کە بە ماتی و پەرێشانی لە ژوورەکەی دەهاتە دەر.

پیرە پیاو کڵاوە خورییە چڵکنەکەی هەتا سەر برۆیانی هێنایە خوار. کووی لە دەستەکانی کرد. دەرگاکەی توند داخست. دەستی لە گیرفانی ڕاکردن.

بەقەد کێویێک بەفر لە نێوەڕاستی کۆڵاندا هەڵدرابۆوە. بەپەلە بە بن دیواریدا غاریدا. لەسەر سەهۆڵەکە خزی. شانی بە دیوارەوەدا. هێندێک قوڕ لە دیوارەکەوە کەوتە سەر سەرو شانی.

خانووەکان هەتا گوێ سوانە لە بەفری کۆڵانەکەدا ون ببوون. تاک و تەرا منداڵان لە کاتێکدا فرمێسک لە چاویاندا قەتیس مابوو و پێستی دەم و چاویان دەزوورایەوە، دەچوونە قوتابخانە.

پیرە پیاو کاتێک لە دەرگای دوکانی خەڵووز فرۆشەکە تێپەڕی، لە دڵی خۆیدا دوتی: "ئەگەر دویێ شەو پارەم هەبوایە..." فایتوونێک کە بە شەقامدا دەڕۆیشت، خەریک بوو خۆی لێدا. فایتوون چییە پیرەکە لەوسەرە کوشم هەڵاتبوو و ئەسپەکانی دەنگ دەدا. سەهۆڵ لە بن پێی ئەسپەکاندا دەشکا. ئەسپەکان بە بێ وازی دەچوونە پێش باقەیەک هەڵم لە لووتیان دەهاتە دەرێ.

گەیشتبۆ پشتەوەی شار. شەقامەکە قەڵەباڵغ تر بوو. چەند منداڵ لە پیادەڕێیەکەدا لەسەر سەهۆڵ خلیسکیان دەکرد. پیرە پیاو بە تەنیشتیاندا رابورد. یەکێک لە منداڵەکان کەوت. پیرە پیاو داهاتەوەو بن پیلی منداڵەکەی گرت. گەرمای بن هەنگڵی منداڵەکە هاتە نێو قامکەکانی. سەیرێکی جزمەی بریقەدارو کڵاوی سوورو جوانی منداڵەکەی کرد. منداڵەکە بە چاوە جوانەکانی تەماشایەکی پیرە پیاوی کردو گوتی: "سوپاس مامە".

پیرە پیاوەکە رووی وەرگێڕاو وەڕێ کەوت. فرمێسک لە چاوەکانیدا قەتیس مابوو. هەنگاوی توندتر کردن. وەختێک گەیشتە پشت شاری، ڕاستەڕێ چۆباغێکی گەورە کە پاسەوانێک لەبەر دەرگاکەی ڕاوەستابوو.

بەری پێیانی سەهۆڵ بەستبووی. بە زەحمەت لێوەکانی کۆ کردنەوە. دڵی ڕێک دەهات. ڕق و قین لە گەرووی گیرابوو. دەیەویست سەر لە میلە ئاسنەکانی دەورەی باغەکە ڕاکێشێ. لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەستەمە، زۆر ئەستەمە، بەڵام تەحەممول دەکەم، سەبر دەکەم، سەبری چکۆڵەی خوا چل ساڵە. دەبی جارێک رایان چەنێنم، ڕاچەناندنێک کە دڵیان ڕاوەستێ. بێ ناموسانە".

ویستی بچێتە ژوورەوەی باغەکە، بەڵام پاسەوان نەی هێشت. پیرەپیاو شتێکی بە گوێی پاسەوانەکەدا چپاندو دەستی بۆ خانووبەرەکەی نێوەڕاستی باغ ڕاداشت. پاسەوانەکە بردی بۆ لای پاسەوانێکی پیر کە لەبەر درگای چوونەژوور ڕاوەستابوو. مەسەلەکەی بۆ باسکرد. پاسەوانە پیرەکە چاوەکانی خۆی هەڵ گلۆفین. دەستی پیرە پیاوی گرت و چوونە ژوور. وەختێک چوونە ژوور، گەرما ڕژایە لەشی مامەپیرەوە. پاسەوانەکە پێی گوت لە گۆشەیەک ڕاوەستێ و بۆ خۆشی چۆ یەکێک لە ژوورەکان. پاش تاوێک هاتە دەرو پیرەپیاوی لەگەڵ خۆی بردە ژوور.

لە ژووری هۆدەکە لە پشت مێزێکی دار گوێز کە شووشەی لەسەر ڕاخرابوو، پیاوێک بە بەرگی ڕێکوپێک و

وەرگێڕانی
عەبدوڵڵا حەسەن زادە



دەموچاوێکی گۆشتن و بۆینباغێکی پانی سپییەوە دانیشتبوو. پاسەوان توند لاقەکانی لێک داو خەبەردار وێستا. پیاوە بۆینباغ سپییەکە سەری لەسەر ئەو کاغەزە کە دەی خوێندەوە هەڵگرت. ڕووی کردە پیرەپیاو و پرسی: "ها، چ باسە، کەسی دیکە نەبوو بە کارەکەت ڕابگا؟!".

پیرە پیاو بە پەشۆکاوی وەڵامی دایەوە: "نەخەیر قوربان، عەرزێکم لە خزمەت جەنابت دا هەبوو، لە خۆت بەولاوە بڕوا بە کەس ناکەم".

—چۆن!! چیت دەوێ؟!

پیرە پیاو بە دزییەوە سەیرێکی دەوروبەری کرد. لە مێزەکە نیزیك تر بۆوە. کەوایەکەی لە ئالاّ بچووکەکەی سەر مێزەکە ئاڵقا. ئالاّکە کەوت. پاسەوان بەپەلە ئالاّکەی هەڵگرتەوە. فووی لێکردو لە جێی خۆی داینایەوە.

پیاوە بۆینباغ سپییەکە لە حاڵێکدا دەکشایەوە دواوە، گوتی: "قسەکەت بکە، بۆچی هێندە نیزیك دەبیەوە؟".

—قوربان... لە... ماڵێ مندا سێ کووپە زێڕ دۆزراونەوە. بەڵێ، قوربان، بە حەزرەتی عەبباس درۆناکەم، بەو وێنەیەی پشت سەرتان، درۆناکەم قوربان.

پێکەنی. پێکەنینەکەی تاڵ و زۆرەملی بوو.

—درۆت نەکردبێ پیرەپیاو. ماڵت لە کوێیە؟

—لە سەر تەپە(*) قوربان. جەنابت تەشریفت بێ. مسۆگەر بە چاوی مەبارەکت کووپەکان دەبینی.بۆینباغ سپی تەلەفونی بۆ چەند کەس کرد. لە خۆشییان وەك گوڵ گەشابۆوە. هەستایە سەر پێ. بە ئارامی و لەسەرەخۆ باڵتۆکەی لەبەر کرد. بەڵام نەی توانی خۆی بانەدا. پیرەپیاو هەمووی ئەمانەی دەدی و هەروا کووی لە دەستانی دەکرد.

وەڕێ کەوتن. چەند کەسی دیکەش هاتن. سواری ترومبیلە ڕەشەکەی نیزیك شەقام بوون و ڕۆیشتن. ترۆمبێلە ڕەشەکە لە قەراخی یەکێك لە شەقامەکانی خوارەوەی شار ڕاوەستا. خەڵك بە سەرسووڕمانەوە سەیری ترومبێلەکەو سوارەکانییان دەکرد. هەتا ئەو دەم لەو جێگایە نەخەڵکی وایان دیبوو، نە ترومبێلی وا.



شۆفێرەکە دابەزی. دەرگای کردەوە. پیاوە بۆینباغ سپییەکەو هاوڕێیەکانی لەگەڵ مامەپیرە دابەزین. پیاوە بۆینباغ سپییەکە کڵاوگەرگەرپییەکەی هێنایە خوار. ئەوانی دیکەش لە حاڵێك دا ملیان لە یەخەی پاڵتۆکانیاندا ون کردبوو، وەڕێ کەوتن. تەنیا مامەپیرە بوو کە لەسەرمان هەڵ دەلەرزی. وەك مەڕێك کە لە ئاخری پاییزدا بڕابێتەوە. هەڵمی هەناسەی لەسەر سمێڵی زەنگۆڵەی بەستبوو. لە رووخساریدا ترس لەگەڵ غەمێکی قووڵ تێکەڵ ببوو، بەڵام ئەوەی لە قووڵایی چرچ و لۆچی نێوچاوانیدا دەبینرا، ڕق و قین بوو. گەیشتنە ئەو کۆڵانە کە ماڵی مامەپیرەی تێدابوو. کەڵەشێرێکی پیر بە خۆڕایی و بێهوودە دەندووکی بەزەویدا دەدا.

پیرە پیاو دەرگای کردەوە. کشایەوە بۆ ئەوەی بچنە ژوور. لەنێو حەوشەدا کێوێك لە بەفر دروست ببوو. دیوارەکان هەتا نیوەیان خووسابوو. شوێنی قشقەڵەکان لەبن دیواری مابوو. ماڵەکە دوو هۆدەی هەبوون، کە یەکیان بانەکەی تەپیبوو. هۆدەکەی دیکە درگایەك و پەنجەرەیەکی هەبوو. پەنجەرەکە توند لێوی پێکەوە نابوون. دەتگوت مردوویەکی ڕەق هەڵاتوە. ولەسەر لێواری خوارەوەیان شوێنی بارانەکانی پێشوو دەبینرا، هەروەك منداڵ شوێنی فرمێسك لەسەر رووومەتیان دەمێنێتەوە.

پیرە پیاو بە پەلە وەپێش کەوت. چوونە ژووری. بۆینباغ سپی فەرمانی بە یەکێك لە هاوڕێیەکانی دا ئامادەی ڕاپۆرت نووسین بێ. پیاوێك کە جانتایەکی ڕەشی لە بن هەنگڵ دا بوو، خەبەردار ڕاوەستاو گوتی: "بەچاوان قوربان، ئەمر فەرموو". ئەمەی گوت و جانتاکەی لێك کردەوە.

لەنێوەڕاستی ژوورەکە کورسییەك کە بە لێفەکۆنێکی چڵکن داپۆشرابوو، بە تازیەداری هەڵ کوشمابوو. زەوییەکە سارد سارد بوو. لەنێو کورسییەکەدا چەند گوونی (تەلیس) کەوتبوون. ولەسەر تاقەی ژوورەکە چرافانۆسێکی دووکەڵاوی لەگەڵ بوو کەڵەیەکی گڵ و چەند تەشیلە دەبینران.

پیاوە بۆینباغ سپییەکە بەسەر سوڕمانەوە لە مامەپیرەی پرسی: "باشە، کوان؟! بۆچی ماتڵ بووی؟!".

مامە پیرە لە نەکاو ڕای کردە لای کورسییەکە. لێفەکەی هەڵدایەوەو بە ڕقەوە هاواری کرد: "ئەمانەن قوربان، هاها. ئەمانەن سێ کووپە زێڕ. باشە بزانن چەند شێنن. بەڵێ قوربان. هاها، قوربان".

پیاوە بۆینباغ سپییەکە و ئەوانی دیکە سەریان بردە پێش وەختێك چاویان بە تاریکاییەکە ڕاهات، لەپڕ پیاوە بۆینباغ سپییەکە سڵەمییەوە. چاوی پێ دەرپەڕین. ژی زێڕینی کچۆڵەیەك ڕژابووە نێو تۆزو خۆڵی قووڵکەی کورسییەکە.

لەبن کورسییەکە دوو کوڕو کچێك دەست لەملانی یەکتر لەسەرمان ڕەق هەڵاتبوون. رووخساری شین و چکۆڵەیان بەرەو میچی خانووەکە وێستابوو. وا دیار بوو چاوەڕێی شتێکن.

هات و هاواری قیناویی مامەپیرە لە حەوشەی دەبیسترا. وەك شێتان دەی نەڕاند: "مەگەر بۆ زێڕ دۆزینەوە بێنە ماڵەکانمان، مەگەر بۆ کووپە زێڕ روو لە ماڵی مانان بکەن".

### پەراوێز

*گەڕەکێکە لە کرماشان.

### سەرچاوە

هەتاو، کۆمەڵە چیرۆکی عەلی ئەشرەف دەروێشان/ وەرگێڕانی عەبدوڵڵا حەسەن زادە، لاپەڕە (13-21).

## چیرۆك

# گۆڕەگاوڕ

*



کوڕیـژگـه جـووڵا. بەسـپایی چاوەکـانی هـەڵێنان. دەم و چاوی ڕەشتاڵەی باوکی کە مووە ماش و برنجییەکانی پێدا بڵاو ببوونـەوە، لـە بەرامبـەر خۆیدا دی. تێگەیشـت وەختـی ڕۆیشتنە.

باوك هیچی نەگوت. تەنانەت وەك ڕۆژەکانی دیکە نەشی گـوت: "یـاڵڵا درەنگـە" بێدەنـگ و هێـدی سـفرەکەیان لـەنێو ناندێنەکە هێنایە دەر. هەریەکەی لەتکە نانێکیان بە دەستەوە گرت و خواردیان. نەختێك دۆیان لە توورەکەیەك کردبوو تا بچۆڕێتـەوەو خەسـت ببـێ و نیوەڕۆیـە نـانی پـێ بخـۆن. وتوێشەبەرەکەیان هەڵگرت و وەدەر کەوتن. دایك حەوشەکەی دەماڵی.

پیاوەکە لە بن دیواری حەوشەی پاچ و پێمەڕەیەکی کلك شکاوی هـەڵگرتن و لـە جـەواڵی نـان. کوڕەکـە دەیزانـی نابـێ کەس چاوی بە پاچ و پێمەڕەکە بکەوێ. پیاوەکە وەختێك بە حەوشەیدا تێپەڕی، لە کن ئاوەڕۆیە دانیشت. سەری بەسەر ئاوەڕۆیەکەدا گرت و سێجار گوتی: "خەونم دی، خێرم دی، یاالله، یامحمد، یاعلی".

کوڕیـژگـە وەدوای بـاوکی کـەوت. لـە پشـتـەوەڕا، بـاوکی چەماوە دیار بوو. وەك ئەوجارە کە ژانەزگەکەی گرتبوو. قۆڵی کەوا ڕەش و تۆزاوییەکەی وەك باڵـە قشـقەڵە بەهـەر دوولایـدا چۆڕابوون.

پێلاوەکـانی ئیـتر بۆنـی کێڵگـەیان لێ نـەدەهات. ئیـدی گوڵەگـەنم و گوڵـەجۆیان پێـوە نەنووسـابوون. ئێسـتا قـوڕاوی بوون و پڕ لە چەقڵی بیابان.

وەختێك لە ماڵێ هاتنە دەر، پیاوەکە دوعای خوێند و بە دەوری خۆیدا سووڕا. دوایەش فوویەکی لە کوڕەکەی کرد.

لە ڕێگا لایان دا تا بە بەر چـاوی جەندرمـەکاندا نـەڕۆن. سـەگەکان بێدەنـگ ببـوون و نـۆرەی کەڵەبابـەکان بـوو کـە ئاوەدانی پڕ کەن لە قوقوو، قوقووی خۆیان.

کـاتێك بـە لای کانییەکـەدا تێپـەڕین، ژنـان و کچـان ئـەو دووەیان دیـتن. ئـەوان توند تێپـەڕین و ملـی بیابانیـان گـرت. شنەبای ئاخری پاییز لەگەڵ تیشکی کەم ڕەنگی خۆر پێستی لەشیانی دەرزی ئاژن دەکرد. کوڕەکە هەستی بە سەرما کرد. باوك بێدەنگ بوو. دوێنـێ شـەو مسـتێکی لـە دەمـی ژنەکـەی ڕاکێشـابوو و دەمـی لـە خوێـن هێنـابوو، کوڕەکـە هیچـی نەگوتبوو، بەڵام چەندی حەز دەکرد کە بقیژێنـێ. ترسـابوو. هـەروەخت بـاوکی شـتێکی دەسـت نەدەکـەوت، لـە مـاڵێدا دارکاری بوو. بە تایبـەتی لەوکاتـەوە کـە ببـووە ڕەشـایی. لە پـاش ئـەو وەختـە بـابی کـەمتر قسـەی دەکـرد. هـەرگیز پێنەدەکـەنی. دەتگـوت زمـانی شـکاوە. تـەنیا ئەوکاتـە کـە گۆڕەکانی دەدایەوە، زمانی دەکرایەوە و قسەی دەکرد.

گۆڕەکـــان لـــە دوورەوە دەرکـــەوتبوون. هەتاو دێیەکەی ڕووناک کردبوو. بەڵام هێشتا نەگەیشتبۆ لای وان. کێوی چل مێردە پێشی خۆرەتاوەی گرتبوو. لە دوورەوە چاکەکەیان دەدی کە لەسەر کێوەکە دانیشتووە و چاوی بڕیوەتە دێیەکە.

وەختێك گەیشتنە بەردەڵان دەوروبەری گۆڕەکان، ڕاوەستان. باوك پشوویەکی دا. کیسە توونتنەکەی دەرهێنا. کوڕەکە پێلاوەکانی داکەند و تەکاندنی. لە دوورەوە جێبی جەندرمە دیاربوو کە دەچۆ گوندی و خەتێکی تۆز و خۆڵی لە دوای خۆیەوە دەکێشا.

گۆڕەکان زۆر بوون. ئەو پۆلەیان چەند ڕۆژ لەمەوبەر باوکی کوڕە دۆزیبوونییەوە. هەتا ئەو وەختە کەس پێی نەدەزانین.

لادێییەکان تووشی نەخۆشی دانەوەی گۆڕەکان (نبش القبور) ببوون. دەستەدەستە ڕەشاییەکان کە زیاتر لە نیوەی ماڵەکانی ئاوەدانی بوون، ڕوویان لە بیابان دەکرد بۆ دانەوەی گۆڕە گاورەکان. چەند جوولەیەك کە شتی عەنتیکەیان دەکڕی زیاتر ئەم کارەیان هان دەدا. شتی نێژراو (دفنیە)یان بە نرخێکی باش دەکڕی و دەیان نارده شار. بەڵام جەندرمە بە توندی پێشی پێ دەگرت. هەتا ئەودەم چەند ککەسیان گرتبوون، دارکارییان کردبوون و ناردبوویاننە دادگا.

کوڕەکە نوقمی تەماشای هەڵفڕینی ئەو باڵندانە بوو کە دەستەدەستە تێدەپەڕین. ئاسمان پڕ لە شەقەی باڵی باڵندەکان بوو. پاش تێپەڕینی باڵندەکان سەرلەنوێ هەموو جێیەك بێدەنگ بوو. پیاوەکە پاچ و پێمەڕەی لە جەواڵی دەرهێنان و دەستی کرد بە هەڵکەندن. لە گاشەبەردەکانەوە دەستیان پێکرد.

پیاوەکە لەگەڵ یەکەم پاچ کە لە زەوییدا، پاڕایەوە: "یا چاکی چل مێردەی".
کوڕیژگە بەردەکانی لەبەردەم پاچەکەی باوکی وەلا دەخست. هەتاو لە پشت چاکی چل مێردەوە دەرکەوتبوو، و ڕاست لە چاوی



وان چەقیبوو. گەیشتبوونە گڵی سوور. کوڕەکە دەیدی کە ئارەقە بەسەر نێواچاوانی باوکییەوە بە زەنگوڵ وێستاوە. بۆخۆشی هەستی بە گەرما دەکرد. لەشی دەخورا. کابرا دەستی کردبوو بە قسەکردن: "چەندم کوێرەوەری چاشت تا ئێرەم دۆزییەوە. ئێرە شوێنەواری شەش قەبری لێدیارە. دوێنێ هیچمان دسەت نەکەوت، بەڵکو ئەمڕۆ شتێك وەبەر نووکی پاچەکەمان بێ. دوێ شەو خەونم دی، چ خەونێك!!"

ڕوویکردە کوڕەکەی کە خەریك بوو بن هەنگڵی خۆی هەڵ دەکڕاندو تەماشای شەهێنێکی گەورەی دەکرد بە ئاسماندا دەفڕی. کوڕەکە ئاوڕی دایەوە سەر باوکی.

دوێنێ شەو لە خەوێم دا نێژراوێکی گەورەم دۆزییەوە. لەم قەبرەدا بوو، یان لە قەبرێکی دیکەدا، نازانم کامیان بوو. هەرچی بوو، قەبرێکی گەورە بوو لە پەنای کێوێك. وەختێك پاچم لێدا، لەنەکاو دوو دەست هاتنە دەرێ و کۆتەڵ (هیکل)ێکی زەلامیان دایە دەستم. کۆتەڵی پاشایەك بوو، لەوانی قەدیم، بە تاج و تەختەوە، وەك ئەو کۆتەڵە کە ماوەیەك لەمەوبەر جوولەکەکان لە کاکە مرادیان کڕیبوو. کۆتەڵەکە زەرد زەرد بوو. زێڕی خالیس. پاشا لەسەر تەختێکی گەورە دانیشتبوو. چەند خۆشحاڵ بووم. لە دڵی خۆمدا دەمگوت بە پارەکەی هەموو کارێك دەکەم. زەوی و جووت و گا دەکڕم، دەچم بۆ

زیارەت و دایکت دەبەمە سەر دوکتۆر لەبەر ژانەزگەکەی.

ڕووی کردە هەتاوو بە دەست لەبن چەنگەی خۆی ڕاکێشاو پشمی. هەوڵی دا جارێکی دیکەش بپشمی، بەلام بێ سوود بوو. لەسەر قسەکانی ڕۆیشت: "ئەمەش پەنا بەخوا. ئەگەر شانسمان هەبێ و کەس پێ نەزانێ، زۆر باش دەبێ. بەلام باوك سەگانە وەك دێو وان. هەر کە ناوت بردن دەڵێی مووت لێ هەڵ پرووزاندوون، زوو پەیدا دەبن. لەوانەیە لەم شەش گۆڕەدا شتێکمان چنگ کەوێ. دوێنێ مەشەدی جاسم لێم لالووت بوو. سەلامم لێکرد، بە نابەدڵی جوابی دامەوە. دیار بوو دراوی قەند و چایەکەی دەیوست. بۆیە شەوێ تووڕە بووم و لە دایکتم دا. ئەتۆش گەورە بی و ژن بێنی، ئەگەر پارەت نەبێ و خەجاڵەتی خەڵکی بی، لە ژنەکەت دەدەی. لەمنیش خەراپتری لێ دەدەی. ها، پێت وانەبێ. بەلام باشە، کار نییە خوا چاکی نەکا. عەنتیکەیەك چاری هەمووان دەکا. بەڵێ، دەمگوت کە پاشا لەسەر تەختێکی گەورە دانیشتبوو. بەلام چەند قورس بوو!!"

بێدەنگ بوو. ڕووی کردە کوڕەکەی کە خەریك بوو هێلانە مێروولەی دەکۆڵیەوە، گوتی: "بڵێ خێر دەبێ ئیشەڵلا. هەروەخت کەسێك خەونی بۆ گێڕایتەوە بڵێ خێر دەبێ ئیشەڵلا".

کوریژگە بە دەنگێکی وشك تفی خۆی قووت دایەوە. زاری وەك هەمبانە ڕەقە وشك هەلاتبوو. زەینی لەسەر هێڵێکی سپی بوو کە لە ئاسماندا لە کلکی فڕۆکەیەکی گەورە دەهاتە دەر.

باوکە دووبارە گوتی: "بڵێ خێر دەبێ ئیشەڵلا. چما گوێت کون نییە، هەتیوە چەمووشە؟!"

کوڕیژگە مێروولەیەك بە لاقیدا نووسابوو، لێی کردەوەو بەپەلە گوتی: "خێر دەبێ ئیشەڵلا. خێر دەبێ ئیشەڵلا".

کابرا گوتی: "بڵێ بزانم ئەتۆ بەم زووانە خەونێکت نەدیوە"؟

کوڕکە گوتی: "بۆچی. بۆچی. لە خەوێمدا، لە خەوێمدا پەڵە هەورێکی گەورە بەسەر خانووەکەماندا کەوت، خانووەکە ڕووخاو سەرم شکا".

پیاوەکە گوتی: "خێر دەبێ ئیشەڵلا".

بەلام لەنەکاو نێو چاوانی تێك ناو گوتی: "بڕوانە ئەو خەون دیتنەی. بنیادەمی بەدبەخت، خەون دیتنیشی بەدبەختییە".

پاشان بەڕاوێژێکی دڵسۆزانەوە گوتی: "هەروەخت خەونت دی چ چاك، چ خەراپ، بچۆ سەر کونی ئاوەڕۆی حەوزەکەو سێجار بڵێ خەونم دی، خێرم دی، یاالله، محمد، یا علی، باشە"؟

کوڕەکە بە قەو گوتی: "باشە. باشە".

کابرا لەسەر چۆکان لەنێو قەبرەکەدا دانیشتبوو. خەریك بوو سەری لە قەبرەکەدا ون دەبوو. گڵی دەوروبەری نوێ بوو، و لەبەر هەتاوەکە پان ببۆوە. هەتاو بە تینوویی مژی لەگەڵەکەدەدا. دۆی نێو توورەکەکە چۆڕابۆوەو خەست ببوو. دەستیان لە کار کێشابوەوەو نانیان خوارد. پەلەوەر نەدەفڕی. ئاسمان هەساو بوو. چل مێردە لەبەر هەتاو وێژینگی دەدان.

کابرا دەستی بۆ لای چاکی درێژ کردو پاڕایەوە: "چاکی چل مێردەی، کۆترە دارینەیەك و چوار مۆمم نەزری تۆ بن، ئەگەر نێژراوێکی باشمان دەست کەوێ".

دەستی بە دەم و وچاوی خۆیدا هێناو ماوەیەك ڕاما. کوڕیژگە کەوتەوە بیری فرمێسکی ئەو مۆمە کە دوو پشکی پێ درووست کردبوو.

خۆر سەرەو شۆڕ ببۆوە. کابرا هێشتا وردە ئێسقانی لە گۆڕەکە دەردێنان. کوڕیژگەماندووبوو. بەبێ وازی گڵی دەوروبەری باوکی دەردەدا. یادی دایکی دەکردەوە کە چۆن ئێواران لەبەر دەرگا دادەنیشت و لە دوورەوە کە ئەوانی چاو دەکرد، چەند بەنیگەرانییەوە دەی ڕوانی. دەتگوت دەیەوێ لە دوورڕا بزانێ چییان دیوەتەوە.

کابرا دووبارە کەوتبۆوە داوی خەونەکەی: "کۆتەڵەکە قورس بوو. قورس تریش دەبوو. بەتەنێ نەمدەتوانی بەرزی کەمەوە. تۆو دایکیشت هاتنە یاریدەم. هەناسەم تەنگ دەبوو. دەتگوت مۆتەم سوار بووە. بەترس و لەرزەوە لە خەو ڕاپەڕیم".

پیاوەکە لە پڕ بێدەنگ بوو. کوڕەکە سەری بردە نێو گۆڕەکە بزانێ چ بووە. مووروویەك بە ئەندازەی قامکێك لەنێو دەستی بابی دا بوو. کابرا بە تفی زاری مووروووەکەی خاوێن کردەوە. کوڕیژگە لە خۆشییان بازی دایە نێو قەبرەکە تا لە نیزیکەوە مووروووەکە ببینێ.

مووروووەکە شین بوو. هەر دوو سەری لەژێر گیرابوون. هەردووکیان بە سەرسوڕمانەوە چاویان تێوە بڕیبوو. لەسەر مووروووەکە دوو سەربازی قەدیمی بەقەڵغان و نێزەوە، بە حاڵەتی هێرش ڕاوەستابوون. نێزەکانیان بەرەو ڕووی باب و کوڕەکە ڕاگرتبوو. چەند جوان بوو! مووروووەکە مزگێنیی شتی زیاتری دەدا.

کابرا لە خۆشییان لەشی کەوتە مێروولەکردن. پشتی ڕاست کردەوە تا هەناسەیەکی ڕەحەت هەڵکێشێ. خڕە بەردێك کەوتە نێو قەبرەکە: "نەبزوون، دەرێنن بزانم چیتان دۆزیوەتەوە دایك سەگینە."

ڕاچەنین. سەریان هەڵ بڕی و تەماشای سەرەوەیان کرد. دوو جەندرمە بە تفەنگەکانیان سێرەیان لێگرتبوو.

**پەراوێز**

هەمان سەرچاوەی پێشوو

## چیرۆك

# زوڵم ئاوا

وەرگێڕانی
ناسرسەلاحی



لەوێ لەسەر تاقە دارتووەکەی ئاوایی، دڵگیر و پەشۆکاو و غەمگین، بە ڕوخسارێکی بەهەتاو و فرمێسك سووتاوەوە، دانیشتبوو. ڕادیۆ چکۆڵە کۆنەکەی باوکی بە بەرزترین لقەوە هەڵواسرابوو. بۆ ئەوەی لە تەنیایی ڕزگاری بێت جاروبار ڕادیۆکەی دەرکردەوە. بوغز و ناڕاحەتی گەروی گرتبوو. نیگەران بوو. لەکاتی هەڵگەڕان بە دارەکەدا بەرە دەستەکانی ڕوشابوون. بێ ئۆقرە و سەرلێشێواو چاکەتە خوساو و دڕاوەکەی باوکی لە خۆیەوە دەهاڵاند، بێهێز و برسی بوو. نەیدەزانی چی بکات. مێشکی ئاڵۆز و دڵی پڕ لە دەردو پەژارەبوو.

چاوی بە لافاوەکەدا دەگێڕا، کە ئەو و دارەکەی لە خۆگرتبوو و هەتا داوێنی تەپۆڵکە دوورەکانیشی داگرتبوو. چاوی دخشا، دەخشا تا ئەو شوێنەی کە باوکی لە ئاوەکە هاتبووە دەرێ و بۆ وەرگرتنی یارمەتی خۆی گەیاندبووە ئەو جادەیەی کە بۆ شار و دێهاتەکانی دیکە دەڕۆی.

خۆشی باش نەیدەزانی چی ڕوویداوە. لەگەڵ باوکی سەربانی ماڵەکەیان بە باگردێن دەگێڕا، تا ئەو درز و قڵشانە پڕبکەنەوە کە بە بارانی چەند ڕۆژی پێشوو تێی کردبوو. دایکی لەگەڵ خوشك و دوو برا چکۆڵەکەی لە

ژوورەوە دانیشتبوون و وئەو لە کلاوڕۆژنەی سەربانەکەوە گوێی لە دەنگی دایکی بوو کە هۆرەیەکی خۆشی دەخوێند، ئاوازێك کە هەمیشە دڵی ئەمی ئازار دەدا. هەر لەو کلاوڕۆژنەوە کە ڕووناکی لێوە دەچووە ژووری دایکی بینی کە لە پشت دار قالبەکەوە دانیشتووە و بە پەنجە باریکەکان و پشتی چەماوەیەوە ئیشی دەکرد. ئەوەشی دەزانی کە پێنج مانگە دایکی لەسەرە ئەو قاڵبە چکۆڵەیە ئیش دەکات. ئیشێك کە لەوەپێش پارەکەیان خواردبوو.

باوکی ڕادیۆ چکۆڵە نیوداشەکەی کە زۆری خۆش دەویست و بە دەست پێوەگرتن و گێڕانەوە لە زاری ئەوان کڕیبووی، بەملی ئەودا بەردابۆوەو گوێی لەو ئاوازانە دەگرت کە لێیەوە بڵاودەکرانەوە.

ئاسمان کە لە بەیانییەوە شڵەژابوو، تاریکتر بوو. بروسکەیەکی لێدا و هەورە گرمەیەك گوندی لەراندو تارکایی باڵی بەسەر زوڵم ئاوادا کێشا. (بۆرە) سەگە کوڵکنەکەیان لە خوارەوە قورسکاندی، مریشکەکان دەستیان کرد بە گارە گار و باوکی سڵاوەتی لێدا و دەنگی تێکشکان و هاوار هاوار و باعە باع و شریخە و داڕووخان لە دوورەوە دەهات. باران بە خوڕەم بەسەر گونددا دەباری.

(پەنج عەلی) و کوڕەکەی کە شوانی ئاوایی بوون، بەپەلە بەرەو بەرزاییەکان ڕایان کرد. هاواری ئەوان لەگەڵ غەڵبەغەڵب و هەورە گرمە تێکەڵ بوو. لەناکاو ئاو هەموو لایەکی گرتەوە. ئەو و باوکی تا ویستیان بجوڵێن ماڵەکە جوولا. باوکی تەنیا توانی باوەش بەودا بکات و بە ڕاکردن بیگەیەنێتە سەربانی ماڵی (موحیب عەلی) و لەوێوە خۆیان بگەیەننە دارتووەکەو بچنە سەری. باوکی لە پێشدا ئەوی خستە سەر دارەکە و بۆ خۆی کە تا ناوقەدی لەناو شەپۆلە توند و قوڕاوییەکاندا نقوم بووبوو، پەلە قاژەی دەکرد و بەهەوڵ و تەقەلای خی کێشایە سەر، کە ئاوڕیان دایەوە نە ماڵێك مابوو نەشوێنەوارێك. دیواری ماڵی (موحیب عەلی) کە لە دیواری ماڵی ئەوان بەرزتر بوو خەریك بوو ژێر ئاو دەکەوت. لەسەر دارەکەوە لە دوورەوە گوندیان دەبینی کە چۆن وەك کەسێك کە خەریکە بخنکێ و هیچ هیوای نەماوە، لەچاو وون دەبوو، ئەو بڵقانەی کە ڕەنگە لە دەمی دایك و خوشك یان براکانییەوە هاتبنە دەرێ، لەسەر ئاوەکە دەتەقین.

لە زوڵم ئاوا، بێجگە لە کوخێك کە لە قەراغ ڕەزی قەدپاڵی تەپۆڵکەکان بوو، هەروەها جگە لە ماڵی ئاغا و عەمباری گەنمی (جیهانگیرخان) کە لەبەرد و وچیمەنتۆ دروست کرابوون، هیچ شتێکی تر نەمابۆوە، چەند ژن و منداڵ لەپەنای ڕەزەکە دەگریان و قوڕیان دەپێواو ڕوومەتیان دەڕنیەوەو سەر ئاوەکەش پڕبوو لە کا و دار و چیلکە و پشقل. جاروبار سەرو گوێلاکی ئەو کەسانەی پەلەقاژەیان دەکرد و ڕۆدەچوونەوە، ئەو سەگانەی بەرەو تەپۆڵکەکان دەڕۆیشتن، ئەو مەڕانەی قوڕس دەبوون و دەخنکان، ئەو مانگا و وئەسپانەی کە بە مەلە بەرەو تەپۆڵکەکان دەڕۆیشتن، دەبیندران.

بۆ دوایین کەڕەت لە دوورەوە چاوی بەبالای ترسێنەری دایکی کەوت. سەرپۆشەکەی لە سەری کرابۆوە پرچە ئاڵۆزو ڕەشەکانی کەوتبوونە سەردەم و چاوانی. چاوە هیوا بڕاوەکانی لە ئەو بڕیبوو و بێهوودە دەستەکانی بۆ شوێنێك دەگێڕا کە خۆی پێ بگرێتەوە. شەپۆلێکی توند ئەوی لە خۆیدا نوقم کرد، ئەو شوێنەیش کە ئەو لێبوو کا و پشقلەکان دایان پۆشی. ویستی خۆی هەڵداتە نێو ئاوەکەوە. بەڵام باوکی کە هەناسەی سواربیوو و گێژ ومات و ڕەش داگیرساو دیاربوو، ئەوی گرت و لەسەر لقێك داینیشاندەوە.

ڕادیۆکەی لە بێنەوبەرەی ڕاکردندا بەساغی مابۆوە، لەملی کوڕە چکۆلەکەی کردەوەو بە بەرزترین لقدا هەڵیواسی. پاشان چاوەکانی لێکنا و کردنیەوە و لە دیتنی ئەوەی بەسەریان هاتبوو نالاندی بەدوو دەست بەسەری خۆیدا کێشاو گریانێکی جەرگ بڕی دەست پێکرد ئەویش بە دڵێکی پڕ و دەم و چاوێکی تەڕ و تا لێهاتووەوە لەگەڵ باوکیدا گریا.

گریانێکی وا کە تەنیا جارێکی دیکە، بە باوکیەوە بینیوە، ئەویش ئەو کاتە بوو کە مانگاکەیان لە برسان مردار بۆوە. کەوتە بیری (نەسرەت)ی برا چکۆلەی کە سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە لە کاتی خواردنی نانی بەیانیدا چایەکەی ڕشتبوو.

نەسرەت بێتاوان بوو. دەیویست پارویێك نان لێبکاتەوە، بەڵام چونکە نانەکە جیڕ بوو لە ناکاو دەستەتی لە پیاڵە چاکە دراو چاکەی ڕشت و باوکی لا ڕوومەتی بەزللە سوور هەڵگەڕاند و دایکی جنێوی پێدا. ئیتر چایان بۆ تێنەکردەوە. هەروا بوو هەرکەس چایەکەی بڕشتایە چای بۆ تێنەدەکرایەوە. نەسرەت ئەو نانەی لەشەو مابۆوە بەداخ و خەفەتەوە خواردی ئێستاش لە بیری مابوو کە ڕەگە ناسك و باریکەکانی لاملی دەرئەپەڕین و چاوی ئەنووقاند تا پاروەکەی قوت ئەدا.

کوڕە چکۆلەکە لەژێر لێوەوە گوتی: (ئەو ئاواتە لەسەر دڵی نەسرەت مایەوە! ئاواتی چایەکی شیرین.)

چاوەکانی نوقاند و لەبەر خۆیەوە گوتی:

(ڕەنگە خەونم دیبێت. خوایە خەون بێت، خەونبێت.)

بەڵام بوونی ئەو لەسەر ئەو دارە، سەرما و با و باران، ئەو هەموو ئاوەی کە زوڵم ئاوای داپۆشیبوو، تەنیایی ئەو، نا ئەمە خەون نەبوو. باڵندەیەکی تەنیا بە باڵە فڕە لە دارەکە نزیك بۆوە. ویستی بنیشێتەوە، ئەوی دی، لە شەقەی باڵیدا و ئەو و دارەکەی بە تەنیا جێهێشت. کوڕە چکۆلەکە، سەروچاوی خوساوی بەرbaranی بە قوڵی چاکەتەکەی سڕیەوەو دەستی کرد بە گریان.

باوکی ئەوی لەوێ دانابوو و، بۆ وەرگرتنی یارمەتی لە ئاوەکەی دابوو و ڕۆیشتبوو، ئاخرین گریان و ماچ و دوعاکانی لەبیر مابوو. بەڕوخساری زەرد و مژۆڵە سوورەکانی، بە دەستە زبر و گرێ گرێکانی کە دەتگوت دەمی مشارە، ئەوی لاواندەوە و ماچیکرد و ڕۆیشت. هەتا بەڵکو شتێکی دەست بکەوێت و ئەو لە برسیەتی و مردن ڕزگار بکات.

شەوی ڕەش و شووم و سارد بەڕێوە بوو. نەحەپی حەپی سەگەکانی مەڕی ئاوایی و نەدەنگی گەڕانەوەی ڕانە مەڕەکە لە دەشت و کێو، نە دەنگی نێوە نێوەی دایکی کە مریشکەکانی لە کولانەکە دەکرد، تەنیا دەنگی باوبۆران بوو لەناو لقەکانی دارتووەکە دەنگی دەدایەوە. بۆ چرکەساتێك وایزانی کە دایکی لەناوەندی ئاوەکەوە، چرایەکی

بەدەستەوەیە و بەرەو لای دێتە پێش. بە ئیشتیا چاوەکانی کردەوە. بەڵام کەس دیارنەبوو. تەنیا شەوقی ئەو ئاگرانەی کە خەڵك لەسەر تەپۆڵکە دوورەکان کردبوویانەوە لەناو ئاوکەدا دیاربوون. تەنیایی، ڕادیۆکەی بیر خستەوە، هەڵیکرد:

(گوگوش خان تۆ حەز لە چ خواردنێك دەکەیت؟)

ڕادیۆکەی کوژاندەوەو تفەکەی قوتدا. لەسەرمادا لەرزی لێنیشت و چاکەتە تەڕ و شڕەکەی باوکی توند لەخۆی ئاڵاند و دیسانەوە بۆ ئەوەی لە چنگ تەنیایی ڕزگاری بێت ڕادیۆکەی کردەوە:

(گوگوش خان بۆچی ئاڵای ئەمریکات خۆش دەوێت؟ دەبینم ئاڵایەکی ئەمریکا بە پشت کراسەکەتەوە دوراوە.)

—وایە ئیتر بۆتە مۆد. کە لە فەرەنسا بووم)...

ڕادیۆکەی بێ دەنگ کرد و لە شەوقی ئاگرەکان ڕاما کە لەناو ئاوەکەدا سەمایان دەکرد. بۆ خۆشی لە گەورەیی ئەو هەموو کارەساتە بێ ئاگابوو. بڕوای نەدەکرد کە ئیتردایکی و دوو براو خوشکی نەماون.

کەوتەوە بیری (بۆرە) بەر بەلافاوەکە قورسکەیەکی سامناکی لێوە هاتبوو. نەیدەزانی (بۆرە) بۆکوێ چووە. لەو تاریکییەدا با دەیلوراند لە ناکاو گریانی هاتێ. سەری لەسەر لقی دارتووەکەی داناو بەکوڵ گریا. هەنیسکە هەنیسکە گریانەکەی لەگەڵ هاڕەی لافاوەکەدا تێکەڵاوبوو. (با) دەنگی گریانی لگەڵ خۆیدا دەهێنا. دەنگی مناڵێکی برسی دەهێنا. دەنگی باعە باع و قورسکە قورسکی دەهێنا و ئەو بە توندی خۆی بەدارکەوە نووساندبوو. سەر لە نوێ پەنای بۆ ڕادیۆکە بردەوە:

(زەردی من بۆ تۆ، سووری تۆ بۆ من. مناڵەکان چەپڵە لێدەن. مناڵەکان هەڵپەڕن. شایی بکەن.

بەڵێ گوێگری ئازیز! لەگەڵ ئەوەی ئەمساڵ بۆ بەرگرتن لەبەر فراوانتر بوونی شۆڕەکات و پاراستنی بنچکەکان، چیلکەی لێ نەبوو بۆ کردنەوەی ئاگری چوار شەممە سووری، لەگەڵ ئەوەشدا چڵ و چیلکە قاچاخەکان، ئاهەنگی خەڵکیان ڕازاندەوە.)

هات و هاواری مناڵەکان بۆ ساتێك ئەویان بردە دنیایەکی دیکەوە. بەڵام کزەی ساردی باو برسیەتی، ئەویان هێنایەوە هۆش. قاچەکانی شەختەیان کردبوو، باران کاری کردبووە سەر پێستی لەشی. دەستەکانی واتەزیو و بێ هێزبیوون کە نەیتوانی ڕادیۆکە بکوژێنێتەوە. لە دوورەوە شەوقەکان بەرەو نەمان دەڕۆیشتن. ئازارێك بەسکی بەتاڵیدا دەگەڕا. ئەم ئازارە لە قوڕگییەوە سەردەکەوت و دەمی پڕ دەکرد لە ئاو. بە چێژەوە ئاوی ناو دەمی قوت دەدایەوە. دەستەکانی بە زۆر بەلقی دارەکەوە بەند کردبوو. جگە لە نان و وچای بەیانی تا ئەو کاتە هیچی دیکەی نەخواردبوو. برسی و بێ هێز و سەرما لێدراو، چاوەکانی کردەوە. وای خەیاڵ کرد باوکی لە دوورەوە بە سفرەیەك نان و کوڵێك چیلکەی وشك بەرەو لای دێ و، دایکیشی سەماوەرەکە دادەگیرسێنێ. (نەسرەت)ی برا چکۆلەکەشی چایەکی شیرینی دیکە دەخواتەوەو خوشکەشی لەسەر نانخواردن پەرپوەتە کوڵی براکەی دیکەی. لە تاریکاییدا دەستە سەهۆڵ بەستووەکانی درێژکرد هەتا نان وەرگرێ، بەڵام هیچی بۆ وەرنەگیرا. لەسەر دارەکەوە سەرەوبن بەتاریکاییەکەدا کەوتە خوار. ئاو دەمی کردەوەو هەڵیلوشی. پەلەقاژەی کرد. هاتە سەر ئاوەکە. هاواری کرد... بۆ هەمیشە نوقم بوو.

کونە پەپوویەك لە دوورەوە بەرەو دارەکە هات و لە قەراخ ڕادیۆکە نیشتەوە و، پاشان لە دەنگەدەنگی ڕادیۆکە سڵەمیەوەو دوور هەڵفڕی.

* * *

پیاوەکە،ماندوو و بە دڵێکی کەیلی ئازار و سنگێکی پڕ لە خەفەتەوە گەڕایەوە. سەر لەنوێ لە ئاوەکەی دایەوە. لە دوورەوە دارتووەکەی دیت بە تەنیا لەناو ئاوەکەدایە. زۆر لە چاوی کرد بەڵکو چاوی بە کوڕەکەی بکەوێ، چاکەتەکەی خۆی بینی کە بەلقێکەوە شۆڕ بۆتەوە. بیری کردەوە کە ڕەنگە کوڕەکەی لە پشت چاکەتەکەوە دانیشتبێ.

خۆر دەرکەوت. پەڵە هەوری گەورە گەورە لێرەو لەوێ بەئاسماندا بڵاوبیوونەوە. پیاوەکە سەری بە هەر شوێنێکدا کرد ئاو بوو، تەنیا ئاو. تەپۆڵکەکان لە خەڵکی برسی جمەیان دەهات، لافاوەکە هەموو شتێکی لەگەڵ خیدا ڕامالیبوو. ئەو جادەیەی کە بۆ شار دەچوو ئاو گرتبووی و بێ کەڵك ببوو.

برسیەتی ئازاری دەدا. بەڵام ئاواتی ڕزگارکردنی تەنیا کوڕەکەی وای لێدەکرد کە هەست بە ماندوویێتی نەکات و لە هەوڵدان نەوەستێت. وبە هەوڵ و تەقەڵلا خۆی گەیاندە دارەکە. سەرکەوت. خێرا چاکەتەکەی لە دارەکە کردەوە. هیچ کەس لەوێ نەبوو. دەستی کرد بە ناڵەو گریان و بەری چاوی تاریك بوو.

ڕادیۆکە بە دەنگێکی کزەوە هەواڵەکانی بڵاودەکردەوە:

(لە چەند دێهاتی دەوروبەری کرماشان لافاو هەستاوە. بەڵام خەسارەتی گیانی نەبووە. ئەم دێهاتانە پێشتر چۆڵ کراون. لەرێگای ئاسمانەوە ئارد و خورمایان گەیاندۆتە ئەو دێهاتانەی کە لەلافاودا گیریان خواردووە. وچەند کۆپتەرێك بۆ ڕزگارکردنی خەڵکەکە بەهانایانەوە چوون.)

پیاوەکە، بەرق و قینەوە هەڵمەتی برد بۆ ڕادیۆکە، هەر چەندە زۆریشی خۆش دەویست، لە کاتێکدا کەفی دەپرژاند بە جنێو و قسەی سووکەوە بەرزی کردەوە و بەقەدی دارەکەیدا کێشا. ئەوەندەی کێشا بە قەدی دارەکە هەتا ورد و خاشی کرد. بەهەر دوو دەستی بردی بۆ دەمی و گازێکی لەبەرگی ڕدیۆکە گرت و سەر لە نوێ بەقەدی دارەکەیدا کێشایەوە و بەهەموو هێزی فڕێی دایە ناو ئاوەکەو هاواری کرد:

—درۆزن! درۆزنی دایك حیز، دایك حیزی درۆزن!

لەو کاتەدا ڕوانییە تەپۆڵکە دوورەکان، واهاتە بەرچاوی کە تەواوی ئەو خەڵکانەی کە لەسەر تەپۆڵکەکانن. سەرلێشێواو و برسی و سەرمالێدراون، هەستی کرد ئەو دایکانەی کە مندالە مردووەکانیان لە باوەشدا بە سنگیانەوە دەگوشی هەموو جنێو دەدەن. هەرکەس کە ڕادیۆی هەیە بە پێلەقە وردو خاشی دەکات.

## سەرچاوە

از ندارد تا دارد چاپ دوم، 1376.

# بـــەفـرین

وەرگێڕانی: مەریوان هەڵە بجەیی

بەفرین لە ژێر تیشکی خۆرەتاو لە سوچێکی هەیوانەکەدا لە باوەشی دایکیدا دانیشتبوو پاڵیدابوو بە سنگییەوە. دایکی توند بەفرینی لەنێوان هەردوو ئەژنۆی خۆیدا گرتبوو. قژە زێڕینەکانی بەفرین، لە ژێر ددانی شانەکەدا نەرم و نیان بەسەرپێستی سپی و جوانی شانو ملییدا بڵاودەبوەوە. لەگەڵ هەرشانە پیاهێنانێك قژی ئەڵقە ئەڵقە لەسەریەك لول دەبوو: "ئای گوێم! گوێمت هەڵکەند!"

—چیبووە؟! ڕەنگە گوێی تۆ لە کاغەز دروستکرابێت ئەگەر گوێی مرۆڤ بە قژ داهێنان هەڵبکەندرابایە ئێستا هیچکەس لە دنیادا گوێی نەبوو. بەفرین خێرا دەستی هێنا بە گوێی خۆیدا. بەوردی سەیری دەستی خۆی کرد بۆ ئەوەی دڵنیابێت و بزانێ گوێی خوێنی لێهاتووە یان نا. دایکی بە گاڵتەوە وتی: "هەی هەی، هەی هەی گوێت لێبۆتەوە و تۆ ئاگات لێنییە. ئەبێ ئەمڕۆ بچم بۆلای مامۆمەقدورو گوێی بزنێکت بۆ بکڕم." مناڵکە میزیکردبوو بە خۆیدا و بە پەنجە لە قوڕەکەی ژێر خۆی دخوارد. ژنەکە ڕوویکردە مناڵەکە: "ئەهای یوسف... قخە... قخە... ئەی تف لە کاروکردارت! سەیرکە چ مڵچە مڵچێ دەکات. داماوە ئەڵێی پاقلاوای تەنوری ئەخوات." لەسەر کونە لوتێکی مناڵەکە گلۆپێك فویتێدە بێت و دەتەقێت..

یوسف بە قنەخلیسکە خۆی گەیاندە دایکی. بەفرین خۆی لە نێوان دوو ئەژنۆی دایکی دەربازکرد. ژنە کراسی مناڵەکەی گرتوو لوتی پێسڕی دەستیکرد بە دەمی داو تۆپەڵێ قوڕی لە دەمی دەرهێنا. گلۆپەکەی لوتی بەرگوڵی سووری کراسەکەی کەوتو هێدی هێدی بچووکبوویەوەو نەما. ژنە چوە ژوورەوە. لە سوچێکی تاریکدا پارچە خێمەیەکی کۆنەی هەڵگرتوو لەسەر ئەردەکە ڕایخست. خێمەکەی پێچایە یویسفەوە. بەفرین نزیکی دایکی بویەوەو پشتی تێکردو وەستا. ژنە مناڵەکەی بەست بە پشتییەوە: "ئەگەر زۆر بێتاقەتیکرد بیکەرەوە. ئاگاداربە نەیخەیت! ئاگات لە مریشکو جوجکەکان بێ. دەست نەکەیت بەکونی مارو مێرووەدا! شتی پیس هەڵنەگری بیخۆی. کەمێ زەڵاتەی دوێنی شەوماوەتەوە نیوە ڕۆ بەنانەوە بیخۆ، نانی ڕشەقو شەکرم خستوەتە دەلاقەیەك. هەرکاتێ یوسف برسی بوو. وردیکە و بیکە بە هەویر و بیدەرێ. مەیەڵە مێش بنیشێ بەدەموچاویەوە." هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە کارەکانی بە بەفرین دەسپارد، تورەکەی نانەکەی هەڵگرتوو ڕۆشت بەرەو لای دیوارە گڵەکەوە و لەبەر خۆیەوە وتی: "ئەمە دووانەو ئەمەش تەورداس." لە سوچی دیوارەکەدا هەڵیگرتن و بەستنی بە کەمەرییەوەر ئەو کلاڤە حەبلەی هەڵگرتو دایبەشانیدا کە لەلای



پلیکانەکەدا کەوتبوو. هێشتا پێینەنابوە سەر پلیکانەکە بەفرین یوسفی بە تەکانێ خستە سەر کۆڵی. دەستی بە سەرداوێنیدا هێناو نامەیەکی لۆچبووی لە گیرفانی دەرهێنا. چەند دێڕی نامەکە کە دەستی بەسەردا هاتبوو سڕابویەوە، پیشانی دایکیداو. ملی لارکردەوەو بە شەرموو پاڕانەوەوە وتی: "دایە دیسان دەیخوێنیتەوە بۆم؟"

ژنە گەڕایەوە. لێوەکانی بەزەردەخەنەیەکی وشکرایەوە. نامەکەی لە کچە وەرگرتو ڕامایە ڕووخساری زەردی کچەکە: "وا خەریکە ڕۆژئاوا دەبێ. دوو ڕۆژە ئەم نامە هاتووەو هەزار جار بۆم خوێندیتەوە. بەخوا ماندووبووم." لەپڕ بەزەیی هاتەوە پێیدا و دەستیهێنا بە سەریدا: "ئەمڕۆ کچێکی چاکبە و هەرچیم پێوتی

ئەنجامی بدە تا دەمەو ئێوارە کە لە قامیشەڵان دەگەڕێمەوە دیسان بۆت دەخوێنمەوە." بەفرین بەهێوری سەری نا بە سنگی دایکیەوەو کراسەکەی ماچکرد. نامەکەی هەڵگرتو خستیە گیرفانی. هەردوو دەستی لە پشتەوەو لە ژێر کەفەڵی مناڵەکەوە گەیاند بە یەک. مناڵەکە کە هەستیکرد دایکی دەیەوێ بڕوات، لچی هەڵقورچاندو ڕویکردە لای دایکی، بەڵام بەفرین چەند جارێ هەڵبەزیەوە. مناڵەکە کەوتە پێکەنین. بەفرین ڕایکرد بۆ خواری حەوشەکەو لەلای کولانەی مریشك و جوجکەکاندا دانیشت. دایك، لە کۆڵانەوە گوێی لە قاقای پێکەنینی مناڵەکە بو دڵی ئارامیگرت.

* * *

ژنە گەشتە دامێنی گردەکە. پەتی دووانەکە مەچەکی ئازاردەدا. کردیەوەو بە دەستەکەی تری گرتی. حەبلەکەی بەسەر پشتیەوە جێبەجێکرد و چاوی بڕیە ئەو ڕێگا پێچاوپێچەی کە لە نوکی گردەکەوە دەهاتە خوارەوە و پانو فراوان دەبوو، پیاوێك خەریکی تلکردنەوەی کۆڵە چیلکەیەك بوو لە تووله ڕێگایەکدا. جارجار کۆڵە چیلکەکە پیاوەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشاو لە تولە ڕێگاکە دەیکردە دەرەوە. تەپوتۆزێکی زۆر لە دوایەوە هەڵدەستاو پیاوەکە بۆ ماوەی چەند ساتێ لەناو تەپوتۆزەکەدا دیارنەدەما. مامۆ مەقدوری شوان کەمێ لەولای ڕانەکەوە بە بێڵەکانەکەیەوە پیشۆکی هەڵدەکەندو گۆرانییەکی خەمگینانەی دەوت: "بەگاسنی خەم، زەوی خەمم کێڵا، تۆوی خەمم تیا چاند. بەرهەم خەم بوو. بە دەستی خەم درەومکرد.

گەنمی خەمم برد بۆ ئاشی خەم.
ئاردی خەمم بە ئاوی خەم کرد بە هەویر
لە تەنوری خەمدا برژاندم.
نانی خەمم خستە سەر سفرەی خەم.
خەم بووە هاو خوانم.
لەلایدا دانیشتمو لەگەڵیدا خواردم."

—سەلامۆ عەلەیك مامۆ مەقدور!

پیرەمێردەکە هەستایەوەو لای کردەوە:
"عەلەیکە سەلام سەلیمەخان. دەنگوباسی حەمە!"

—دوو سێ ڕۆژ لەمەو پێش نامەیەکی هات، نووسیویەتی تاوەکو چەند ڕۆژێکی تر ئیزن وەردەگرێت و دێتەوە سەرێکمان لێبدات.

—خوا ئاگاداری بێت. بەخەیر و خۆشیەوە بێتەوە ئیشەڵا.

—سەلامەتبیت. خوا تەمەن درێژتکات.

سەلیمە گەیشتە لای داربەڕووی سەرگردەکە. قەلەڕەشێك نیشتەوە بە داربەڕووەکەوە و سێ جار قاڕاندی سەلیمە بەقەلەڕەشەکەی وت: "خێر بێ... خێر بێ... خێربێ." بە پەنجەی ئاماژەی ئارەقی بڕۆی سڕی پشتی چەماندەوەو چوە سەر تولە ڕێگاکە. لە نیوەی ڕێگادا گەشت بەو پیاوەی کە کۆڵە چیلکەکەی دەهێنایە خوارەوە، دراوسێکەی بوو، ناسیەوە: "ماندوو نەبی خاڵۆ مەولود."



—ساغو سەلامەتبیت خوشکم. چ ناوەخت هاتوویت!

سەلیمە ئیسراحەتێکی کرد: "خاڵۆژنی مناڵدار نیوەی هی خوینیە. تاوەکو مناڵەکانم ئامادەکرد نیوەڕۆهات." پیاوەکە وتی: "چاکێکەی لەوایە لە ڕۆژگاری بەهاردا هەموو کەسێ بە ئارەزووی خۆی دەگات. تا حەزکەی ڕۆژگار درێژە." وە ئاماژەی کرد بۆ جێگایەکی دووری سەرگردەکە: "ئاگات لە قامشەڵانبێت. گیانلەبەرەکان لەناو شریخەی میکو ترساونو لە پرپەلامارەدەن."

—ئاگام لە خۆمە خاڵۆ. مرۆڤی ڕوتوپەتی پاڵەوانی خوایە. خۆم لەوانکەم1 نیم. وەرزی سەوزو جوانی بەهار هەموو ئەو ناوەی گرتبووەوەو بابۆنی شکۆفەی تاڵی بادامەکێویەکانی دەهێنا. سەلیمە ماندووبوو. داسەکەی بە چەپ و ڕاستدا دەهێنا بە ناو لقوپۆی گیاکاندا و ئارەقی دەکرد. ڕوومەتی سوور ببوویەوەو وەك نانی برژاو ناسکی لێهاتبوو. دەمەو ئێوارە بوو.

پاڵیدا بە کۆتەرەیەکەوە. ویستی پەتی دووانەکەی بکاتەوە شریخەیەك قامیشەڵانەکەی هێنایە لەرزین. چەند شکۆفە لەدار بادامە کێویەکە بونەوەو پەرپەڕ بون و کەوتنە ئەردەکە. سەلیمە ترساو ڕاپەڕی سێ فرۆکە بەرزدەبوونەوە. لە پشتگردێکەوە تەپوتۆزی تەقینەوەیەك بەرزبویەوە بە ئاسماندا. بایەکی ئارام هێدی هێدی، تەپوتۆزەکەی کەم دەکردەوەو دەیبرد بەرەولای ئەو دێیەی کە ئێستا لە نزیك ژنەوە ماتوو بێدەنگ بوو. سەلیمە بە

ئارامی لە ژێر لێوەوە دەیوت: "شوکر بۆ خوا زۆر دوورە لە ئێمە." لەگەڵ شریخەی چەند تەقینەوەیەکی تردا چۆلەکەکان بەجیکەجیکێکی سەیر هەڵفڕینو هەموو ئەو ناوە چۆڵو بێدەنگ بوو. لقێ بەرقەدی درەختێ دەکەوێ و دەنگێکی وەک لەشخوراندن بەنینۆک بەرگوی دەکەوێ، بۆنێکی پیسوو نادیار جێگای بۆنی تاڵی شکۆفەی بادامە کێویەکە دەگرێتەوە. سەلیمە هەستی بە خورانی گەرووی کرد. کۆکی هەستایەوەو بە نیگەرانییەوە کۆڵە چیلکەکەی خستە توولە ڕێگایەک.

* * *

پەرو باڵی هەتاو بەسەر دەشتوو گردە دوورەکانەوە لادەچوو نەدەما. ڕەنگی دیکە لە ژێر سێبەری گردەکە داشینی دەنواندن. سەلیمە سەری حەبلکەی توند پێچابوو بە دەستیەوەو هێواش هێواش بەدەم ئارەقکردنەوە لە لۆفەی هەرپێچێکدا کۆڵەکەی تلدەکردەوەو حەبلەکەی شلوتوند دەکردەوە بۆ ئەوەی لە دەستی دەرنەچێت و لەگەڵ خۆی تلینەکاتەوە بۆ ناو دەربەندەکە. گەیشتە دواین لۆفەی گردەکە، هەناسەی تەنگ دەبوو. هێشتا ئەو بۆنە نادیارە بە ئاسماندا بڵاودەبویەوە. جارجارێ بۆنەکە زۆرتر دەبوو جارجاریش بە شنە بایەک کەم دەبووەوە. سەلیمە لەسەر ئەردەکە دانیشتوو کۆڵە چیلکەکەی بەزەحمەت هەڵگرت. ناو لەپی دەستی گەرم ببوو دەکزایەوە. گەیشتە لای داربەڕووەکە. قەلەڕەشێک کەوتبوو بە پشتاو قاچی بە حەواوە بوو. مامۆ مەقدور بە بێدەنگ و ئارام پاڵیدابوو بە درەختێکەوە ژنە باش گوێیلێنەبوو. مامۆ مەقدور وەک هەمیشە وتبێتی: "ماندو نەبی. بەخێر بێیت!" بەڵام ژنە بە ماندوویەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وەڵامی هەمیشەیی دایەوە: "سەلامەتبیت مامۆ!"

بە گومانەوە سەیری لای مامۆ مەقدوریکرد، مامۆسەری خستبوە سەر ئەژنۆی. بێڵەکانەکەی لە ژێر باڵیدا بوو. هەردوو دەستی بۆ پێشەوە درێژ ببوو. ڕیشکی گیایەکی نیوە جواو لەبەردەمیدا تفکرابویەوە. ژنە وایزانی مامۆ خەریکی بەستنی قەیتانی پێڵاوەکەیەتی. کۆکەیەکی کردو بەدەنگی بەرز وتی: "مامۆ تۆ دایمە خەوتوی وا ئێوارەیە. ماڵئاوا بە تەمای کەی ڕانەکە بگەڕێنیتەوە." مامۆ نەجولا. ژنە ڕامایە مەڕەکان، سەریان خستبوە سەرپشتی یەکا و بێدەنگبون و نەدەکۆکین، کاوێژیان نەدەکرد. سەگی ڕانەملی نابویە ناو فێنکی خۆڵەکەوە. بایەکی ئارام دەهات. بۆنەکە کەم و کەم دەبویەوەن بەڵام ژنە هێشتا گەروی دەخورا. بەنیگەرانییەکی نادیارەوە حەبلەکەی بەردا، کۆڵە چیلکەکە کەوتە سەر ئەردەکە. بەرەو لای مامۆ ڕۆشت. باڵندەیەک کە لە دوورەوە خوێندی: "وەی وەی... وەی وەی... وەی وەی..." ترس و نیگەرانی کەوتە گیانی سەلیمە، بەڵام چوە پێشەوە. بەگومانەوە دەستی خستە سەر پشتی مامۆ: "مامۆ بۆچی..." مامۆ تلایەوەو کەوتە سەر ئەردەکەو چاوەدەرپۆقیوەکانی ڕامابویە ئاسمان. سەلیمە قیژاندی و دوورکەوتەوە لە مامۆ. قاچی هەڵکەوت لەیەکێ لەمەڕەکان و کەوت بەسەرمەڕێکی تردا. بەقیژە قیژ هەڵبەزیەوە. سەگی ڕانەکە لە جێگاکەی خۆیدا وشکببوو. سەلیمە دەستیکرد بە سنگکوتان. سەر وێنەکەی کەوت. بەنینۆک بەربوویە ڕوومەتی خۆی و بە قاچە بێهێزەکانیەوە ڕایکرد بەرەو ماڵەوە. لە دەروازەی دێکەدا گەیشتە یەکەمین ماڵ.

ماڵی خاڵۆ مەولود بوو. کۆڵە چیلکەکەی هێشتا لەلای دیواری حەوشەکەدابوو. خاڵۆ کەمێ کەوتبوو بەسەر لادا. پاڵیدابو بە دیواری خانوەکەیەوە. کڵاوێکی نیوە چنراوی بەدەستەوە بوو. کلافەی دەزووەکەی بەرەو خوار کەوبتوو. سەری دەزووەکە لە ژێر دانیەوە و بەلالێویەوە شۆڕ ببویەوە. سەلیمە بەربوە ڕومەتی خۆی. لە جێگای نینۆکەکانیەوە خوێن فیچقەی کردە دەرەوە. هاواریکرد: "خاڵۆ... خاڵۆچ بەڵایەکمان بەسەرا هاتووە؟!" خاڵۆ بە چاوەدەرپۆقیوەکانیەوە ڕامابوە لێواری پەنجەرەی دیوارەکە ئەو بۆنە نادیارە لەگەڵ هاتنی باکەدا کەموزۆر دەبوو، ژنە بەدەم کۆکینەوە خۆیکێشا بە دەرگا تەختەکەی خۆیاندا. دیوارێکیان بەین بوو لەگەڵ ماڵی خاڵۆمەولودا. دەرگاکەی کردەوە: "بەفرین.. هۆ بەفرین! ئازیزەکەم لە کوێی؟!" بەپەلە خۆی گەیاندە کولانەی مریشکەکان: "بەفرین گیان، یوسفە جوانەکەم، خەوتوون، دایکتان بمرێ. نیوەڕۆ هیچتان خواردوە یان نا!" بەفرین وەک دایکێکی دڵسۆز یوسفی لەسەر دەستە باریکەکەی خۆی خەواندبوو.

جوجکەکان لەلای مریشکەکاندا بڵاوببوونەوەو کەوتبوون، بەبێ گیان مریشکەکان سەریان لە ژێر باڵیاندا بوو، وشکببون. ژنە دەستە بچوک و چڵکنەکە بەفرینی جولاند بۆ ئەوەی خەبەریکاتەوە. نامەکە لە بەینی یوسف و بەفریندا بە ئارامی دەجولا. چەند دێری نامەکە کە دەستی پیا سوابوو زیاتر سڕابوویەوە: "کچە جوانەکەم بەفرین لە دوورەوە ماچت دەکەم و چەناگە جوان و خڕەکەت گاز لێدەگرم. تاوەکو چەند ڕۆژی تر ئێزن لە خاوەن کارەکەم وەردەگرم و..." مێروولەیەکی تۆپیو لەسەر چەناکەی شینەوەبووی بەفرین لکابوو بەوردەنانێکەوە.

**تێبینی:** ئەم چیرۆکە و چیرۆکەکانی کە دواتر دێن لەلایەن برای بەڕێز (مەریوان هەڵەبجەیی)یەوە وەرگێڕدراوە.

# وێنەی سوتاو



من لێرە لە سکی دایکم دام. دایکم لەلای کوانوەکەدا، لەناو دووکەڵو هەڵمدا وەستاوە. ئاوی مەنجەڵەکە دەکوڵێ. بۆشتنی جلوبەرگ. هەموو شتەکان لە جێگای خۆیاندان هیچ شتێك ناجوڵێ تەنانەت چاوەجوان و کلکراوەکەی دایکیشم کە سەیری کامێراکەی سەید مورادی دراوسێمان دەکات. تەنافی جلوبەرگ لەپشتیەوە، لە سوچێکی حەوشەکەوە بەسراوە بەدارهەناره تەنیاکەی لای دیوارەکەوە. پەتێك هەڵواسراوە بەدرەختەکەوە. ئەوپەتەی کە تائێستاش بە بەبیرهێنانەوەی بێتاقەت دەبم. سەری پەتەکە بەسراوە بەقاچی چۆلەکەیەکەوە. چۆلەکەکە خۆی دیارنییە قاچی لە ڕانیەوە لێبوەتەوە. ئەگەر کوڕەکەی سەید موراد ئەو شەوە چۆلەکە ئازیزەکەی نەدەخستە سەر لقیدار هەنارەکەو قاچی توند نەدەبەستەوە، ئێستا ئەو قاچە ناسك و بێ گیانە هەڵنەواسرابوو بەو پەتەوە نەیتوانی بوو لە دەست پشیلەکە دەرچێت و ڕاکات. چ تاوانێ! ئەم پەتە بەو قاچە بێ تواناو لاوازەوە، هەمیشە لە زەینمدا مایەوەو لە دوای ئەوە ئیدی هیچ کاتێ نەمتوانی باڵندەیەك بگرم و ڕایگرم. سەید موراد لەو ڕۆژانەدا لە دوای چەندین ساڵ شاگردی، کامێرایەکی مۆدیل کۆنی کڕی بوو دەیویست تاقیبکاتەوە سەید موراد بەدڵنیاییەوە ئێستا سەری کردوە بەناو قوشی ڕەشی کامێراکەدا و لەناو ئەو تاریکیە دا ئارەقی کردەوەو بەدەم کۆکەوە لەناو دووکەڵو هەڵمدا سەیری دایکم دەکات.

—ڕاوەستە، مەجوڵێ زەهراخان! سەیرم کە.. ئامادە!

نیو سابونێکی جلشۆرین بە دەستی ڕاستی دایەوەیە. بە دەستی چەپیشی زەختی خستوەتە ژێر مەمکی چەپی سەر ئەو شوێنەی کە هەمیشە ئێشی دەهات، یادگاری زەربەی ئانیشکی پیاوێ لە ڕیزی نانەوادا کوت مت هەر لەو جێگایەو لە ژێر دڵمدا پەڵەیەکی شین هەیە و هەمیشە ئازاری هەیە. مانگ گیرانە.

بیرم نایە لەو نۆمانگ و نۆ ڕۆژەی کە تۆم لە سکدا بوە دێو یا ئەژدیهایەك لە ئاسماندا دەستی خستبێتە گەروی مانگەوە. ئەم شین بونەوە و ئازارە کۆنە هی لێدانی ئەو جزمە لەپێ زۆردارە بوو کە پارەیەکی سەوزو تازەی بە دەستەوەبوو. من لەسکی دایکم دا بووم کە بەزەربەیەك هەردووکمانی فڕێ دایە ئاخری ڕیزەکەوەو خۆیی جێگاکەمانی گرت:

—کوڕم، ڕۆڵە گیان! ساڵ دوانزەمانگە جێگامان ئاخری ڕیزبوە.

سەید موراد لەناو تاریکیەکەوە هاواری کرد:

—ئامادە، زەهراخان بوەستە! سەیری من کە!

چەندین ساڵە وێنەکە ونبووبوو. بەڵام ئێستا، زەبروزۆری بۆمبادایە وە بەدیواری ژوورەکەدا ئەو بە چاوانی نیوە کراوەوە، لە پشت قژە ئاڵۆزکاو خەناوییەکەیەوە ڕامابوە سنوقە شکاوەکەی کونجی ژوورە وێرانەکە. هەر ئەو سنووقەی کە کلدانەکەی تێدەخست. کە بەشە نوقڵەکەی تێدەخستو هەرگیز نەیدەخواردو هەڵیدەگرت بۆ ئێمە. ئەو سنوقەی کە هێشتا قژی زێڕین و بڕاوی منالێ ئێمەی تیابوو. ئێستا دایە خەریکە بەچاوانی نیوەکراوەیەوە سەیری سنوقو وێنەو قژی زێڕینی من دەکات:

—کەی دەمبەی بۆ زیارەت تاوەکو قژت بگرمە زێڕ؟

دایە هیچی لێنەهاتوە. یەدەم بەزەردە خەنیەکی تاڵەوە دەوتوە، بەڵام پیر هەرچەند چاوەکانی کلی پێوە نییە، بەڵام دایە، بە مردویش جوانە. وەك خۆی کە هەمیشە جوان بوو. کە لە بازاڕی کولیچە فرۆشەکانەوە تێدەپەڕین من ڕام دەکرد بەدوایدا، دوکاندارەکان دەوەستان و سەیری ئەویان دەکرد. دەمزانی لەبەر جوانیەکەیەتی. بەڵام دایە هەمیشە بەچاکی عەباکەی دەپێچا بە خۆیەوە:

—وەك مرۆڤی نەدیو بدی چاوێکیان دەبوو بە چوار چاو!

وەم لە داخا و بەدەست ئەنقەست ئەو تەختەیەی کە بە دەستمەوە بوو دەمکرد بەناو تەشتە مسەگەورەکانیاندا کە پڕبوو لە هەویری کولیچە. دواین دیدارمان بوو کە ترسا بوو، ڕەنگی پەڕیبوو، بەچاوانی



فرمێسکاوی و سوور هەڵگەڕاوەوە هات بۆماڵەوەو هەواڵەکەی پێگەیاندم:

"ئەزانی چیبووە ڕۆڵە؟ دوو سەعات لەمەو پێش دایان لە حەشارگەکە. تاوەکو ڕاداریان لێدا، لەناوەڕاستی بازاڕەوە خۆم گەیاندە لای حەشارگەکە، کە گەیتشمە بەردەم دەرگاکەی هێشتا نەچوو بوومە ژوورەوە گوێم لە دەنگی تەقینەوەبوو. بۆمبایەك دای لە ناوەڕاستی چوار ڕێیانی حەشارگەکە.

سەدەها کەس ترنجابوونە ناو حەشارگەکە. لە بەلا دووربن ژن و پیاو و پیرو گەنج، بە پەرتاو هاتنە دەرەوە شەلوپەتو خوێناوی ژن و پیاوێکی پیریان تیابوو کە هەرگیز لە بیرم ناچێ هەر هێندەی کە گەیشتنە بەردەم دەرگای حەشارگەکە و هەوای ئازاد دای لە دەم و چاویان، بەبێ دەنگ هەر لەوێدا دانیشتن. ژنەکە سەری نا بە سنگی پیاوەکەوەو لە پڕ هەردووکیان پێکەوە مردن. پەڵەیەك بەسەر و لەشوو دەموچاویانەوە نەبوو. وا دەزانم یازراویان تەقی بوو یا دڵیان تەقیبوو. بەڕوکەش هیچیان نەبوو بەپەلە هاتن وو بەهێوری و بەبێ دەنگ دانیشتنو مردن شتی وا سەیرم نەدیبوو. چومە پێشەوەو ڕام وەشاندن. هەر ئەووت ئێستا نا سەد ساڵە مردوون. دووکەڵێکی تەنك لە وێنەکە هەستاوە. دووکەڵ ژوورەکەی گرتوەتەوە. ئایا ئەمە هەر ئەو دووکەڵەی کوانوەکەی دایەیە کە چەندین ساڵ لەمەوپێش لە ژێر مەنجەڵەکەیەوە دەهاتە دەر؟ نا، ئەمە دووکەڵی شەڕە.

سواری تەنکی دووکەڵەکە دەبم کە وەك سیمورغ پەڕوباڵی کردووەتەوە. حەوت گۆچانی ئاسن. حەوت جوت پێڵاوی پۆڵا چل سەبەتە نان. چل مەشکە ئاو. لەگەڵ چەقۆیەك بۆ بڕینی گیانم ئەو کاتەی کە نان نامێنێ. ئەی یادەوەرییەکان، لەمنی غەریب و بی کەس هەڵمەیەن لەم شەوە ئەستەمەدا جگە لە ئێوە هیچم بۆ نەماوەتەوە.

# کۆڕی یادکردنەوە



بەخێرایی ڕامدەکرد، بەترسەوە، بە پەلە، ئەڵێی دڵم کەوتوەتە ناو گیرفانی تەنگی کراسکەمەوەو ناتوانێت بێتە دەرەوە. باوکم دا ئەنەوێتەوەو ئیدی ناتوانێت ڕاکات. لە کۆڵانێکدا دائەنیشین و باوکم پاڵ ئەدات بە دیوارێکەوە. بڵندگۆکان لە دوورەوە هاوارئەکەن: "بەهێزی مشتەکۆڵە دەمی نۆکەرانی داگیرکەر ئەشکێنین." سەیری دەمی باوکم ئەکەم. لێوی سپی بوەتەوەو دەلەرزێ. دڵم نایە سەیری دەموچاوی بکەم. شووشەی چاوی چەپی عەینەکەکەی شکاوە. خوێن لە نێو چاوانیەوە هاتوەتە خوارەوە و ڕژاوەتە سەر پێڵوی چەپی و لەوێوە تا ژێرچەناگەی هاتوە و تکتک دەتکێتە سەر سنگی. سەری سێ تلۆقەی گەورەی کردوە، تلۆقەی یەکەم کەبەسەر نێو چاوانیەوەیەتی تەقیوە و دوانەکەی تر لە ژێر قژە تەنکەکەیەوە شینەکاتەوە. باوکم ئیسراحەتێك ئەكات. قسە ناکات. لەبەر خۆمەوە دەڵێم لاڵنەبوبێت دەست دەکات بە گیرفانی داو بە تەکانێ ناواخنی دڕاوی کراسەکەی دەردێنێ. دەیخاتە سەر ئەردەکە. شقارتەیەك دەردێنێ و نێو ئاخنی کراسەکە دەسوتێنی بۆنی نێو ئاخنەکە حاڵم چاك دەکاتەوە. باوکم سووتوەکە دەخاتە سەر تلۆقە تەقیوەکەی نێو چاوی و بە هەناسە بڕکێ دەڵێ: "هەی داد هەی بێداد." تازە ئەزانم لاڵنەبوە. درێژە ئەدات بە قسەکانی: "بە دایکت مەڵێ بۆکوێ چوین"

"بەسەرچاو بابە پێیناڵێم، بەڵام ئەگەر پرسی..."

"هەیداد هەی بێداد. چاکە چی دەڵێی؟"

"نازانم بڵێم چی." "بڵێ دەمانویست سواری پاسبین کە..."

لێوە وشکو ڕەنگ پەڕیوەکەی بە زمان تەڕدەکات و دەڵێ: "زۆر تینومە." سەیری دەوروبەرم دەکەم. لە دوورەوە چەند کەسێك ڕادەکەن و دەنگی بڵندگۆکان دێت کە لە پەسا جنێو دەدات بە داگیرکەرانی جیهانی و نۆکەرانیان. "لەم نزیکانەدا ئاو نییە بابە." "بەدایکت بڵێ ئەمانویست سواری

پاسبین لەسەر سەرە بوبەشەڕ، دوو کەس پەلاماری یەکیان داو ئێمەش ویستمان جیایان کەینەوە لەیەك. پاشان..." دەستێ دێنی بە پەڕۆسوتاوەکەی سەرسەریدا: "وە پاشان یەکێکیان هات بدات بەسەر ئەویتریاندا کە بەر سەری باوکم کەوت..." "بڵێم بەچی لێیاندا؟" "بە تەختە، بەزنجیر، بەشیشی ئاسن، بەهەر شتێ کە خۆت بە باشی دەزانی، بە هەرشتێ، مەگەر تا ئێستا شەڕت نەدیوە. شەو و ڕۆژ تەلەفزیۆن شەڕو شۆڕ و بگرەوبەردە پیشاندەدات."

عەینەکە شکاوەکە بەسەر چاوییەوە لادەبات و بەسوچێکی کراسەکەی کەلەکاتی ڕاکردندا لەناو پانتۆڵەکەی دەرهاتبوو پاکیدەکاتەوە پێستی سپی ناوسکی دەبینم کە ناوبەناو جێگای ناشیرینی سووتاوی پێوە دیارە. "هەی داد هەی بێداد." دەست بەسەر پێستە سوتاوەکەدا دێنێ، بەچاوی ڕاستی سەیرم دەکات. بۆ چەندەمین جار بیرەوەرییەکانی لە نیگایدا دەخوێنمەوە: "ئێشکگر منی لەسەر تەختەیەك هەڵاژاندبوو. هەردوو قاچی بەستبومەوەو بە جگەرە پێستی سنگ و ناوسکمی دەسوتاند. دەستەکانمی بۆ نوسین کردبویەوە. هەرچەند دەقیقەیەك جارێ هەڵمی ئەساندمەوەو دەیوت: "بنووسە" من داماووماندو جگەرەکەم لە دەستی ئەو وەرئەگرتو نەفەسێکم لێئەدا و دووبارە دەمدایەوە بەدەستیەوەو ئەو هەر بەوجگەرەیە منی دەسوتاند." لە دوورەوە بڵندگۆکان هاواریان ئەکرد.

"مردن بۆ نۆکەرانی داگیرکەر" باوکم بە نوکی پەنجەی زەخت دەخاتە سەر پەڕۆ سووتاوەکەی سەرسەری و دەڵێ: "نۆکەرانی داگیرکەر!" ڕوودەکاتە من! "زۆر ڕەنگت پەڕیوە کوڕم، مەترسە دوورن لە ئێمە."

"ناترسم بابە. لەنێو چاوانت دەترسم کە هێشتا خوێنی لێدێت."

"مەترسە هیچ نییە. ئەو پیرەمێردە داماوەت دی چی بەسەرهات؟"

دێتەوە یادم کە پیرەمێردەکە ڕایدەکرد. لەڕێگادا کە دەرۆشتین ئەو ماندی. باوکم سڵاوی لێکرد و تەوقەیانکردپێکەوە. باوکم بە ئاسپایی لە پەنایگوێمدا وتی: "لە شاعیرە زۆر کۆنەکانە."

لەگەڵ ئەودا چەند هەنگاوێك ڕۆشتین. کاتێ کە دەیویست بە تەنیا بە پلیکانەی مزگەوتەکەدا سەرکەوێت ژێر باڵیمان گرت. بەزەحمەت ئەیتوانی هەناسەبدات پێستی دەموچاوی وەك کاغەز لول ببوو. لە هۆڵەکەدا کورسیان ڕیزکردبوو. لەلای پیرەمێردە شاعیرەکەدا دانیشتین. بێژەر عەینەکێکی ڕەشی لە چاودا بوو، خەریکی خوێندنەوەبوو. خەڵك هاتن و کورسیەکان پڕبوون. چەند کەسێ لەسەر ئەردەکە دانیشتنو چەند کەسێکیش لەلای دیوارەکاندا وەستان. دووکەس لە دوولای هۆڵەکەوە بەوردی وێنەیاندەگرت کە هۆڵەکە پڕبوون دووکەسی گەنج لە چەپ و ڕاستەوەهاتن بەرەولای مێزی بێژەر. کەسێکی بە تەمەنتر کە لەشێکی لاوازی هەبوو لەسەر کورسی ڕیزی پێشەوە هەستاو ڕۆشت بەرەولای بێژەر کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێناو بەناولەپی دایبەپشتی بێژەردا کە هەستێتو بڕوات. بێژەر بەکورپەکورپ بە گۆچانەکەی دەستیەوە ڕۆشت. پیاوە لاوازو باریك ئەندامەکە بە دەنگی بەرز بە بێژەرەکەی وت: "خۆش بەحاڵت کە چاوت نییە تاوەکو ببینی چ کەسانێك لێرە کۆبوونەتەوە." لەپڕ خەڵکەکە زانیان چ باسە. چەند کەسێ ڕایانکرد بەرەو لای ئەو دەرگا گەورەیەی کە هیی هاتنە ژوورەوە بوو. دەنگی توندو بەهێزی شکانی شووشەکان دەهات. دەنگی زنجیرلێدان و هاوار هاوار بەرزبویەوە. پیاوە لاوازو باریك ئەندامەکە هاواریکرد: "برایان دانیشن لەسەر جێگاکانتان و مەجوڵێن. بێدەنگبن با لە بارەی ڕابدرووی کەسایەتی مردووەوە شتێکتان پێبڵێین و ئاگادارتانکەین دیارە چەند کەسێکتان بۆ بەشداریکردن لە کۆڕی یادکرنەوە هاتوون و ئاگادارنین بەڵام چەند کەسێکی تر چاك ئاگادارن و من مەبەستم ئەو چەند کەسەیە."

پیاوێك بەسەرو چاوی خوێناویەوە لەبەردەم من و باوکم و ئەوپیرەمێردە شاعیرەدا تەخت کەوت. پیرەمێردە شاعیرەکە بە دیتنی دەموچاوی خوێناوی ئەو هەستاو بە گۆچانەکەی ئاماژەیکرد بەرەو پیاوە لاوازەکەو هاواریکرد: "ئەم بەرەڵایە چییە؟!" پیاوە لاوازەکە گەڕایەوە بۆلای هاوڕێکانی و ئاماژەیکرد بە پیرەمێردەکەو قیڕاندی: "ئەمە خودی ئەبوجەهلە!" چەند کەس هێرشیانکرد بۆ ئەبوجەهل و یەکێکیان بۆینباخەکەی ئەبوجەهلی گرتوو گرێکەی توندکردەوە. ئێدی من ئەبوجەهلم نەدیەوە.

خەڵکەکە ڕژابوون بە یەکدا و دەنگی زەڕپەی زنجیرەکان دەهات. باوکم خێرا هەستاو دەستیگرتم و بەرەو لای درەگاگەورەکە ڕامانکرد. لەبەردەم دەرگاکەدا بەزنجیردەیاندا لە خەڵکەکەو دەیانوت: "بڕۆن گوێبگرن لە وتار." زنجیرەکان هەڵقەی ئەستوورو گەورە گەورەیان هەبوو.. ئەوانەی کە زنجیریان بە دەستەوەبوو سواری ملی هاوڕێکانیان بوبون و وەك ئەسپ سوار لەسەرەوە زنجیریان دەوەشاند. یەکێ لە سوارەکان گەشت بە ئێمە و زنجیرەکەی دا بە سەری باوکمدا. باوکم کەوتە سەر ئەردەکە، بەڵام دەستی منی بەرنەدا. من کەوتم بەسەرسنگی باوکمداو دیم دەموچاوی پڕبوە لە خوێن و عەینەکەکەی شکاوە باوکم وەك پشیلە ڕاپەڕی و منی لەگەڵ خۆی بردە سووچێکەوە. باوکم زۆر زیرەکی کرد دەستی منی توند گرتبوو ڕایدەکرد. ژێر پێمان پڕبوو لە شوشەو عەینەکە شکاوو ددانی دروستکراو. زنجیرەکان بەرزدەبوونەوە بەئاسماندا و دهاتنەوە خوار بەسەر سەری خەڵکەکدا. چەند کەسێك کەوبتوونە سەر ئەردەکەو دەیاننالاند. هێندەم زانی لە کۆڵانێکداین کۆڵانی پشت مزگەوتەکە. بڵندگۆکان هەر دەیانقیڕاند:



"داگیرکەر... داگیرکەر... داگیرکەر...". بەخێرایی ڕامانکرد تاوەکو گەیشتینە کۆڵانێکی چۆڵ.

باوکم پارچە پەڕۆیەك دەخاتە ژێر چوارچێوەی عەینەکەشکاوەکەی. بە چاوێ سەیری من دەکات و دەڵێ: "دەستو قاچت بریندارنەبووە؟" "نەء"

"کەواتە بەڕێکەوەو لە بیرت نەچێ بە دایکت بڵێی کە لە ڕیزی پاسدا..." میهرنوشی خوشکم بەدیتنی باوکم دەستی کرد بە گریان. داکیم دەدات بە دەستی خۆیداو دەڵێ: "ئاخر تۆ کارت چییە بە شەڕی خەڵکەوە؟ مەگەر پاسەوانیت، مەگەر پۆلیسی، ئەی داماوینە! بۆچی لە هەرشوێنێ کورە هەنگێکی لێبێت دەچن و سەری پیادەکەن؟!" خێرا دەچێ جامێ ئاوی گەرم و خاولییەك دێنێت و ڕووبە باوکم درێژە بە قسەکانی دەدات: "پیاوەکە ئێدی ڕیش و سمێڵت سپی بووە بۆچی وازناهێنی؟ بەچی دایان لەسەرت؟"

"نازانم. هێندە دەزانم بە شتێك لێیاندام. گۆچان بوو. نازانم شیشی ئاسنبوو دیسان نازانم." میهرنۆش بە میهرەبانییەوە گۆرەویەکانی لە پێی باوکم داکەند. دایکم بە توڕەییەوە خاولییەکە دەگوشێ: "بەه بەه، چاوم ڕوون، لەکەیەوە بوە بە باو خەڵك بە دارو کوتەکەوە لە ڕیزی پاسدا بوەستن؟!"

باوکم چاوم لێدادەگرێ: "ڕێکەوت بوو ژنەکە ڕێکەوت بوو."

"بۆچی ڕێکەوتی چاك بۆ ئێمە نابێ. ڕۆژێکیش وەرەوە و بڵێ کارێکی چاکم دەست کەوتوە. ئاخر تاکەی چاوەڕێبم؟ سەیرێکی جل و بەرگی منداڵەکانت بکە، دوایی بڕۆ بەینی شەڕوشۆڕی خەڵك."

باوکم لە تاو گەرمی خاولییەکە سەری لادەبرد: "هەی داد هەی بێداد ئێستاکە کە وام لێهاتوە خۆشحاڵبە کە تەرمەکەمیان نەهێناوەتەوە بۆماڵەوە بۆت." "خۆشحاڵبم؟ لەبەرچی خۆشحاڵبم؟ لەوەی کە لەدوایی بیست و پێنج ساڵ وەستان لەلای تەختەڕەشدا و تۆزی تەباشیر چووە بەسەرتا دەریانکردیت؟ لەوەی کە هەرچیمان هەبوو فرۆشتمان بۆ ئەوەی کە منداڵەکانمان نەمرن لەبرسا؟" "ژنەکە زیندووین زیندوو. سەیری منداڵەکانمان بکەو خۆشحاڵبە." دایکم ئاهێ هەڵئەکێشێ و بە دڵنەرمییەوە دەڵێ: "منداڵەکانمان

ڕێگایـەکی دژواریـان لـە ڕێدایـە." بـاوکم ڕومتێدەکات و بـە ئەسپایی دەڵـێ: "کورم ئـەبی ڕاسـتییەکەی بڵێـین. درۆ مـرۆڤ ماڵویران دەکات." دایکم بەسەرسوڕمانەوە پرسـیارم لێدەکـات: "کـەیوان چـی بـوە قسەبکە؟"

دەڵێم: "کۆڕی یادکردنەوەی شاعیرێ بوو."

دایکم و میـهرنۆش پێکـەوە دەقیژێنـن: "ئەی بۆچی ئێمەتان نەبرد؟!"

دایکم لەباوکم دەپرسێ: "هەر ئەوەی کە دوێنێ شەو باستکرد؟"

باوکم بە خاولییەکە خوێنی نێوچاوانی دەسڕێت و دەخوێنێتەوە.

"بـەڵێ بـەڵێ، ژیـان جوانـە." دایکـم خاولیەکە دەخاتە ناو جامە ئاوەگەرمەکـەو لـەوەڵامی ئـەودا دەخوێنێتـەوە: "ژیـان ئاتەشگەیەکی ئەزەلی و دامەزراوە."

میهرنۆش کە بە دەسڕشووشە ساغەکەی عەینەکەکـەی بـاوکم پاکدەکاتـەوە دەخوێنێتـەوە: "گـەرتاوی بدەیـت، سـەمای بڵێسەکەی لە هەموو شوێنێکەوە دیارە."

مـن فرمێسـکەکانم دەسـڕم و دەخوێنمەوە:

"گەروانەبێ کوژاوەتەوە و کوژانەوەش تاوانی ئێمەیە.



# جێ پێی سوور

پێشکەشە بە شەهیدانی 18 تیر

خەوم دیوە هاتبوو. هەر ئاڵەم جادەی بەرامبەرەوە. لە پاس دابەزی پاڵیدا بە دار "چنار"ی پاڵ کانیەکەوە، پێڵاوەکانی داکەند. لە دوورەوە قاچەکانی پیشاندام وتی: "دایە سەیرکە!" مناڵێ کەمێ لەولاترەوە بە پارچە تەختەیەك زەویەکەی کون دەکرد، پرسی: "دایە تۆپی هێنابوو بۆم؟" ژنە گوێی نەدایە قسەی مناڵەکەو درێژەی دایە قسەکانی خۆی: ڕەنگی وەك مانگ بوو. گۆرەوی سپی لە پێکردبوو، سپی وەك بەفر ژێر پێی پیشاندام و دووبارە وتی: "چاك سەیرکە دایە!" کەمێ زیاتر لێی نزیك بوومەوە خوایە چیم دی. دووپارچە پینەی سووری دابوو لە ژێر گۆرەویەکانی پیاوەکە کە لەلای ژنەدا دانیشتبوو، دەستێکی بەدەموچاوی خۆیدا هێنا و بە ئارامی لەژێر لێوەوە قسەگەلێکی کرد: "خێرە بەلام بۆ ڕەنگی سوور؟"

ژنە وتی: "نازانم... ئەو هەمیشە خۆی گۆرەویەکانی پینەدەکرد. بەلام هیچ کاتێ نەمدی پینەی نەشیاو لێبدات" پاشان دەستەکانی بەرەو ڕووم درێژ کردو دوورکەوتەوەو... دوورکەوتەوە... بەدوای خوێن جێ پێی سووری بەجێهیشتبوو. ئەو جێ پێیە سوورە تا پشت چیاکانی ڕێی سەنگ ئاوا دیاربوو. لە پڕ گورگێکی ڕووتەڵەی گەڕ لە سوچێکەوە دەرچوو و ڕایکرد بەرەو ڕووی جێ پیکانو دەستی کردە لێستنەوەیان. من ترسابووم و ئارەقەم کردبوو. خەبەرم بویەوە. دڵم خەریك بوو لە سینگەوە بێتە دەرەوە".

پیاوەکە وتی: "خێرە. لە خەودا گۆرەوی سپی بینین خراپ نییە بەلام پینەی سوور..." ژنە وتی: "ڕۆیشتم بۆ لای کاکە، دەمی کتێبی بۆ کردمەوە" "چاکە.. چاکە چی وت؟.." "وتی لەخەودا گۆرەوی



سپی بینین پیتو بەرەکەتی تیایە بەلام ئەمەی کە پینەی سووری پێوە بووە شتێکی ترە. خێرێکت لەسەرە و دەبی شتێك قوربانی بکەی کورە بچکۆلەکە خێرا وتی: "حەلْوا" پیاوەکە وتی: "کەڵەشێرێك" ژن و پیاوەکە بێدەنگ بوون و لە زەینی خۆیاندا لە ژێر هەتاوێکی گەرم مناڵێکیان دی دەسرێکی خستبووە سەرسەری و لەسەر خەرمانکوتەکە دانیشتبوو مانگاکانی بەرەو پێش دەبرد.

ژنە کەوتە یادی بیرەوەریە کۆنەکانی، گوێی لە قیژەیەك بوو: "ئای کورەکەم! قاچەکانی لە ژێر تیغەکانی خەرمانکوتەکە دا..." کورە مناڵەکەیان بەسەردەستانەوە بردو جێپێی خوێناویەکانی تا مەودایەکی زۆر بەسەرزەویەکەوە دیاربوون. پیاوەکە هاتەوە سەرخۆی وتی: "بلێی دیسان قاچی شتێکی لێ نەهاتبێ؟ ئاخر هێشتا دوای ئەو هەموو ساڵە قاچی تەواو نییە".

ژنە وتی: "نەمویست هەواڵەکەت پێبلێم".

پیاوەکە نیگەران بوو: "کام هەواڵ؟ بلێ بزانم چی بووە؟" "لە ژنەکەی مام یۆسفم بیست.. مێردەکەی لە شارەوە

هاتبووەوە و هەواڵی هێنابوو کە لەتاران، نیوەشەو پەلاماری بەشی ناوخۆی قوتابیانین داوە".

"کێ پەلاماری داون؟"

"تەنیا وتی پەلاماریان داوەو چەند کەسێکیان لە پەنجەرەکانی سەرەوە خستوەتە خوارەوە بۆ سەرقیرتاوەکە. ئیتر نەیوت چ کەسانێك بون تەنیا ئەمەی وت. خۆی بێ پێیان دەڵی چی بووە".

پیاوەکە بەلەپی دەستی دای بە ئەژنۆیدا: "نیگەرانی قاچەکانیم"

ئەگەر ساغ بوایە دەیتوانی هەڵێ بەلام..." ژنە سەری لەقاند: "شەش مانگی برد تا قاچی چاکبویەوە. لە هەموو خراپتر ئەو ڕەنج و زەحمەتانەبوو کە بۆ تاقیکردنەوەی کۆنکورکێشای چوارمانگ لەشی ڕەنگی حەمامی نەدی. شەوانە لەبەرامبەری دادەنیشتم و هەرکاتێ وەنەوز دەیبردەوە ئاوم لە جامەکە دەردەهێنا و دەمپژاند بەدەم و چاویدا، خۆی پێیوتبووم".

"چ ڕەنجێك، چ ڕەنجێك خوایە!"

"ئاغا ماڵی ژێرمانی بە هەرزان لێکڕین، یادگاری دایەم بوو. دارو نەدارمان فرۆشت تا بەرێیان خست".

کوڕە دووبارە لە دوورەوە و لە بەرامبەریان دەرکەوت. بەشەلەشەل ئەهاتوو ڕانی مەڕی خەڵکی دەلەوەڕاند. لە لەوەڕگا دوورەکانی سەرگردەکانەوە هاتبوو. سەروچاوی لەتاو گەرما تایگرتبوو. "ناردمان بۆ شارەچۆڵە ساڵ لێمان دووربوو. چوو لە ساڵ نان و خورمای خوارد". پیاوەکە سەبیلەکەی خستە ناو تووتنەکەی و پرسی "ئەو شەوەت لە بیرە ولاخەکەی خاڵۆ سۆهرابمان هێنابوو بۆ دار بارکردن؟" ژنە سوچی عەباکەی لادوا وتی: "لەبەر ڕووری لە چاشولکەکەی تا بەیانی هەرنالاندی".

تۆ بەیانی زوو هەستای وتت ولاخەکە ببەوەو بیدەوە بە خاوەنەکەی من دایکم ودەزانم ئەم حەیوانە بێزمانە تا بەیانی چی کێشاوە. ناڵەناڵی جەرگی سوتاندم".

"بەرێ کەوتی بەرەو شار تاکوڕەکەمان ببینین"

"لە ڕێگادا هەر دەگریاین"

"بۆ جاشولکە ولاخەکە..."

"و بۆ کوڕەکەمان."

"شەوانی ئاودێران، کتێبەکانی دەهێنا بۆ سەرکێڵگەکەو هەر لە دەرفەتی بۆ خوێندنەوە کەڵکی وەردەگرت. لەلای چراکە دادەنیشتو هەر دەیخوێندەوەو پێی دەوتم بە زیاتر لە یەك ملیۆن کەس بەشداریان کردووە. ئەوانەی پارەیان هەیە دەچن وانەی تایبەت دەخوێنن یان مامۆستایان هەیە و لەماڵەو وانەیان پێدەڵێن من لێرە تەنیا ئەم کتێبانەم هەیە، دەموت: "خوا ئاگادارت بێ، ئومێدت لە دەست مەدە ڕۆڵەگیان" ژنە وتی: "شتی بەهێزمان بۆ دەکڕی. دۆشاو، خورما و چەندجاریش لەو حەبانەی دەیخەنە ناو ئاوەو. زۆر حەزی لێدەکرد. پەرداخەکەی دەنا بە سەرەوەو دەیوت: "ئای کە بەلەزەتە. وزەی خستە گیانم" لە شەوو ڕۆژدا لە دوو سەعات زیاتر نەدەخەوت، دادەنیشتم و ئاوم بە دەم و چاویدا دەپژاند. مناڵەکە بە هۆی قسەکانی دایك و بابیەوە دەڵێ پڕبوو... وتی: "ئەگەر سەرەی من هات نابێ ئاو بەدەم و چاوم دا بکەی، پێم ناخۆشە لەبری ئەوە خورمام بۆ بکڕە، لە حەبەکانی کاکم بۆ بکڕە.. ژنە بە گاڵتەوە وتی: تاتۆ دبلۆم وەربگری قیر سپی ئەبێ". مناڵەکە ناڕەزایی دەربڕی: "ئاخر ئێوە هەرکاردە\وم بەسەرمان" "کاکەت شتێکی ترە."

"منیش دەبمە شتێکی تر. لەو باشتر ئەگەر ئەو لە شارا بوو بە دوهەم من دەبم بە یەکەم".

"پەنا بە خوا. چاوی ئەو کەسە کوێر بێ ئێرەیت پێدەبات"

"عەلی حەسەن ئیرەیم پێدەبا، نامەوێ کوێربێ لەبەرئەوەی ئیتر ناتوانێت تۆپ تۆپێنم لەگەڵ بکات".

"گاڵتەم کرد کوڕم. خوا نەکا کەس کوێر بێت".

"کاکەم بەڵێنی پێداوم تۆپێکم بۆ بکڕێ، تۆپێکی ڕاستی".

ژنە وتی بەدڵنیاییەوە دەیکڕێ، سەرانسەری ئەم ساڵ دڵم لە لەپی دەستمدابوو. لەبەر دووری ئەو هەرکاتێ کە شۆربایەکەم دروست دەکرد، دەموت خوایە خۆزگە باڵم لێدەرواو قاپێ لەم شۆرباوەم بۆ ببردایە بۆ تاران"

پیاوەکە دووکەڵی سەبیلەکەی لە لوتیەوە دایەدەرەوە: "ناکرێ شۆرباو بۆ یەك کەس بەری، ئەوانی تریش حەزی لێدەکەن. هەر ئەوەماوە بۆنی پیازاخ و ڕۆن و نەعنای گەرم بەربدەیتە ناو زانکۆ. ئەوانی تریش نەفسیان هەیە" مناڵەکە وتی: "باشە با ئەوانی تریش دایکیان باڵ دەربکات و شۆربایان بۆ ببات".

لەناو تەپوتۆزدا، لە دوورەوە کوڕەکەیان دەبینی لە جێگای خەرمان کوتەکەدا هەولی ئەدا باری کەوتوی ولاخێك هەڵگرێتەوە ڕوخساری تەپوماندووبوو. ژنە لە دوورەوە گوێی لێبوو: "قاچەکانم دایە، قاچەکانم..." هاتەوە سەرخۆی و ڕویکردە پیاوەکە:

"ئاخر خوا خراپيان بۆ بكا بۆچی كوڕی خەڵكيان لەوسەرەوە خستوەتە خوارێ؟"

پياوەكە وەڵامی دايەوە: "دەڵێن مانيان گرتووە".

"يانی دەبێ چ بەڵايەكيان بەسەرخۆيان هێنابێت، تا ئێستا شتی وام نەبيستوە" "يانی لەسەر زەوی دانيشتون".

"باشە ڕەنگە ماندووبووبن، ئێمەش ئێستا لێرەو لەسەر ئەم گردە دانيشتوين و چاوەڕوانی هاتنی كوڕەكەمانين... ئەبێ بێن و لەو سەرەوە فڕێمان دەنە خوارەوە؟"

"تەنيا دانەنيشتوون. شتگەلێكيشيان وتوە".

"باشە چەند گەنج ئەگەر پێكەوە كۆبنەوە دەكری بێدەنگبن؟ ئەويش گەنجی ئەوڕۆيی، سەيری گەنجێتی خۆت مەكە كەمێش لە دەمتا دەتۆپی".

"لە بيرت نييە دەهاتمە پشت ديواری ماڵەكەتان و گۆرانيم بۆ دەوتی"

مناڵەكە وتی: "منيش لەگەڵ هاوڕێيانی قوتاخانەم لایديواری قوتابخانە دادەنيشينيو قسە دەكەين. دوێنێش عەباس عەلی جنێوی دا بە ئاغا".

باوك پرسی: "بۆچی جنێوی پێدا؟"

"ئاخر دوێكە تۆپ تۆپێنمان دەكرد ئاغا لە زەويەكەی دەريكردين و گوێی عەباس عەليشی بادا".

دايك وتی: "بەلەعنەت بی، بۆ گوێی مناڵی خەڵك بادەدەی؟ ئەم داماوانە لە بەيانيەوە تا ئێوارە كاردەكەن، لێگەڕێ با سەعاتێكيش پێكەوە بن، ئەی بێرەحم، گەنمی خەڵك هەر بە سەوزی بە هەرزان دەكڕی، فەرشەكانمان بە هەرزان دەكڕی لانيكەم لێگەڕێ با مناڵەكانمان ئاسودەبن".

باوك وتی: "لە دەستی ئەو ئاغايانە دەرچووين و كەوتينە چنگی ئەم ئاغا دەوڵەمەندانە".

دايك لە زەينی خۆيدا چوو بەدوای جێ پێيەكی سووردا كە تاپشت چياكانی سەنگ ئاوا دەرچووبوو. گورگێكی پيری دی جێ پێيەكان دەلێسێتەوەو... ڕويكردە كوڕەكەی وتی: "خەفەت مەخۆ ئازيزەكەم كاكەت بەڵێنەكەی جێبەجێ دەكات"

مناڵەكە بە حەسرەتەوە سەيری ئەو كوللەيەی دەكرد كە لە دەستی بەرببوو و چەند مەتر دوورتر نيشتبوەوە وتی: "بەڵێنی تۆپێكی پێداوم، تۆپێكی ڕاستی نەك لەو تۆپە باغانەی كە مامە حاتەمی دوكاندار لەبەردەم دوكانەكەيدا هەڵيدەواسێ؛ نا، تۆپێكی ڕاستی تۆپێكی خاڵ خاڵی ڕەش و سپی، تازە و نوێ، پڕ لە هەواو ئامادە هەرگيز كون نابێت، سەد لەقەشی لێبدەی بەخۆ نازانێ، هەواكەی دەرناچێ" باوك پرسی: "بيانی؟"

"لە بيانيش چاكتر. كاكەم دەيوت: ئێران خۆی دروستی كردوە"

دايك پرسی: "ئێران دروستی كردووە؟"

"بەڵێ ئێران فڕۆكەشی دروستكردوە. تۆپ كە هيچ نييە مامۆستاكەمان دەيوت دەبابە و زرێپۆشيشی دروست كردووە ئەو ميزڵانەش كە مامە حاتەمی دوكاندار هەيەتی هەمووی ئێران دروستی كردووە، زۆريش بە لەزەتە" چڵمەكەی بە قەد سی سانتی مەتر شۆڕببۆوە. لەپڕ بە هەناسەيەك هەر سی سانتی مەترەكەی هەڵلووشيەوە. دايك ڕووی تيچكردو وتی: "پاكی كەوە هەڵی مەلوشە وا ئەزانی زۆرگرانە. دەستكردی بيانی نييە ئيتر دەست نەكەوێت سەعاتێكی تر دووبارە دروستی دەكەيت" مناڵكە بە عاجزيەوە وتی:

"بەتۆ چی هی خۆمە"

باوك وتی: "زۆركەس دەست و قاچيان شكاوە. چەند كەسێكيشيان كوشتوە" دايك ئاهێكی هەڵكێشا: "خوايە كوڕەكەم داوەتە دەست تۆ. تۆ خۆت دەزانی چەند بێ زەرەروزيانە." دەنگی هۆڕينی پاسێك گەيشتە دەربەندەكە لە پڕ هەرسێكيان پێكەوە هەستان. پاسەكەيان دی لە لۆفەيەكی پێچەڵ و پوچلا تێپەڕی و ديارنەما. بەنيگەرانيەوە لە گردەكە چونە خوارەوە و ڕايانكرد بەرەو لای چناری كن كانيەكەو پاسەكە كە لەلای كانی و جادەكە بوو. پاسەكە ديسان لە پشت گردەكە دەركەوتەوەو هاتە لای درەختەكە. لە گۆڕەپانی دێيەكەدا لەناو تەپوتۆزدا وەستا چەند كەسێك دابەزين. لە دوورەوە ديان دوو كەس ژێر باڵی موسافيرێكيان گرتووەو بەرەو لای ماڵەكان دەيبەن. باوكە لە پێشەوە ڕايدەكردو دايك و منداڵەكەش بەدوايدا. ئەو كەسەی ژێر باڵيان گرتبوو هەردووقاچی لەگەچ گيرابوو. دايك كوڕەكەی خۆی ناسييەوەو دەستی كرد بە لە خۆدان و خۆڕنين. مناڵەكە لە هەمويان زووتر گەيشتە كاكەی و لەكنی وەستاو ماچی كرد كاكە جانتاكەی لە يەكێك لەوكەسانەی لەگەڵی بوو وەرگرت. كرديەوەو تۆپێكی دڕاوی دەرهێناو دای بە مناڵەكە وتی:

"بەچەقۆ كونيان كرد. هەر ئەوشەوە."

مناڵەكە گريا.



# نێرگز بۆ نێرگز

لە پشت جامخانەی گوڵفرۆشیەکەوە دەوستێ، مانگی سەرماوەزە، بەڵام هێشتا نێرگز نەهاتووە. بە حەز و تامەزرۆییەکی زۆرەوە سەیری گوڵەکان دەکات. نا، نێرگز نەهاتووە

"خەتای خۆم بوو. ڕام هێنابوو بە نێرگز"

"نا، خەتای من بوو کە دەموت..."

"کە دەتوت چی؟"

"کە دەموت ساڵ دوانزە مانگە لە چاوەڕوانی کۆتایی پاییزدام تاوەکو نێرگز بێت."

"وە من لە پاش ئەوە هەموو ساڵی گوڵی نێرگزم دەکڕی بۆت. گوڵی وەك خۆت، وەك ناوی خۆت."

پیرەمێردەکە باوەڕناکات کە هێشتا نێرگز نەهاتووە. دەچێتە ناو گوڵفرۆشیەکە: "ئاغا نێرگز نەهاتووە؟"

گوڵفرۆشەکە پیرەمێردەکەی دەناسی. بەناوونیشانا تەنیا وەك مشتەرییەکی دەساڵە. دەساڵ کۆتایی پاییز هاتوە بۆ دوکانەکەی و تاکۆتایی زستان هەموو حەفتەیەك، دوو شەممەکان پێش کاتژمێر نۆی سەرلەبەیانی دوو دەستە گوڵی نێرگزی کڕیوەو ڕۆشتووە.

"ئاغا نێرگز هاتووە"

"بەڵێ ئاغا، هەر ئێستا بۆیان هێنام. نۆبەرەیەو کەمێکیش گرانە."

"قەیناکە، هەر چۆنێ بووە ئەبی گوڵی نێرگز ئامادەکەم"

گوڵەکان دەگرێت و بەتاسەیەکی زۆرەوە بۆنیان دەکات. بەڕێدەکەوێ. هەر لە هەمان ڕێگای ئەو دەساڵەوە، هەر ئەو ڕێگایەی کە هەزاران جار لە تەنیاییدا بە زەینی دا تێپەڕی بوو. ئێستا دەساڵ بەسەر ئەو ڕۆژی دووشەمەیەدا تێپەڕیوە. ئەو ڕۆژەی کە کاتژمێرنۆی سەر لە بەیانی تەلەفونیان کرد بۆ ئەو: وەرە جانتاکەی نێرگز وەربگرە.

بە بیستنی هەواڵەکە، کوڕ بوەوەو کەوتە ڕامانێکی قوڵەوە. شتێك لە سنگیدا وەك کۆتری زامدار باڵەکانی دەدا بە یەکدا بۆ ماوەی ساتێ هۆش کەوتوو پاشان بە ئاسپایی هەستایەوە لە جێگاکەی خۆیدا: "ئەبی بڕۆم. ئەبێ بڕۆم و یادگاریەکانی نێرگز وەربگرم."

کاتێ کە جانتاکەی کردەوە، تیشکێکی سووری لێهاتەدەرەوە. خوێن، بیری کردەوە نەبا لافاوی خوێناو لەناو جانتاکەوە بڕژێتە دەرەوەو هەموو ئەو ناوە داپۆشێ. خێرا دایخست. کار بەدەستەکە وتی: "پیرەمێرد جانتاکە بەرەوە بۆ ماڵەوەو لەوێ بیکەرەوە.



لـێرە قەدەغەیـە." بـەبێ سـەیرکردن بـەکار بـە دەسـتەکەی وت: "دەمەوێ... خۆی... ببینم."

"ئیدی خۆی بە کەڵکی بینین نایەت. ئەم جۆرە شتانە بۆ دیتن ناشێن خێرا ئێرە بەجێبهێڵـە! بـەبێ دەنگە دەنگ بـەبێ شیوەن و گریان یەڵا پیرەمێرد."

دەساڵ لەمەو پێش سەرم سپی نەبوو، بەڵام کاتێ کە جانتاکەم هەڵگرت کاربەدەستەکە دووبارە وتی: "پیرەمێرد بڕۆو سەیری دوای خۆشت مەکە." کەواتە بە دڵنیاییەوە من هەر ئەو ساتە پیربووبووم. کاتێ کە جانتاکەم هەڵگرت پشتم چەمایەوەو ئەژنۆکانم بێهێزبوونوو لەرزین. مەگەر تەمەنی من و نێرگز چەند ساڵ پاشوو پێش بوو؟ تەنیا هەژدە ساڵ. هەژدە ساڵ لەمن بچوکتر بوو من لەوکاتەدا کە جانتاکەم بەدەستەوە بوو سی و هەشت ساڵانبووم. جانتایەکی قورس نەبوو، بەڵام دەترسام خوێن لە درزەکانیەوە دەڵەمە بێتوو بڕژێتە ناو شەقام و ڕێگابگرێتە بەرو بڕواتوو خۆی بگەیەنێ بە مەزاری دایکی و ئاگاداری بکاتەوەو بڵێ: "دایە ئاخری هاتمە لات. ئیدی تەنیا نیت دایە." گوێم لە دەنگی پێبوو لە دوامەوە. ژنو پیاوێك جانتایەکیان پێبوو. جانتاکە بە دەستی پیاوەکەوە بوو. ژنەکە دەگریا. پیاوکە گەیشتە منوو پرسی: "کەسێکی نەبوو؟ دایکێ خوشکێکی نەبوو کە بگری بۆی؟"

وتم: "نا، نێرگزی من بێکەس بوو. یەعنی بێکەس بووین. تەنیا من و ئەو لەم دنیایەدا تەنیا ئەوم هەبوو. عاشقی بووم. تا ئێستا بیستووتە کە باوکێك عاشقی کچی خۆیبێت؟" شانبەشانم دەهاتن بە جانتاکەیانەوە. ژنە وتی: "ئەم جانتایە شتومەکی کوڕەکەمانی تیایە. ئەمڕۆ دایان پێمان." کە سەیری جانتاکەم کرد، دیم خوێنێکی گەشی تیابوو. وتم: "زووتر بیبەن بۆ ماڵەوە. ڕەنگە شەقامەکە پڕکات." پیاوەکە ئاماژەی کرد بە جانتاکەم: "دایکی لە کوێیە؟ ئا لەم کاتانەدا ئەبێ دایکەکان ئامادەبن بۆ شیوەن و گریان" وتم: "وتم کە بێکەسین." تێگەیشتم کە دەیەوێ شتگەلێکی زیاترم لێبپرسێ. وادیاربوو خەمی خۆیان کەم بوو دەیانویست خەمێکی تر لەگەڵ خۆیان بەرنەوە بۆ ماڵەوە. گەشتین بە پارکێك لە ژێر دارسنەوبەرێکی بەرزو بڵنددا دانیشتین. جانتاکانمان بەیەکەوە لەلای درەختەکەدا داناو لەسەر کورسیەك دانیشتین. وتم: "دایکی نێرگز بەسەر نێرگزەوە مرد. توشی نەزیف بوو. خوێنی دەویست نەبوو بۆی پەیاکەم. مرد. من و نێرگز ماینەوە. خۆم گەورەم کرد. لە ئامێزی خۆمدا. بەشیری قوتوو. بۆ هەمو جێگایەك لەگەڵمدا بوو. کاتی قسەکردن لەگەل هاوڕێکانمدا، لەسەر ڕانم دادەنیشتوو گوێی وەك میکرۆفۆن، ئەوەیکە من دەموت وەریدەگرت. جارجار بە ئاوازێکی مناڵانە وەناڕەزایی دەردەبڕی: "ئاه، بابەگیان ئیدی ماندووبووم. کەم قسە بکە." قژیم تۆپزی کورتکردبووەوە. کاتێ کە گەورە تر بوو قژیم سفردەکرد. چونکە ناچار بووم لەگەل خۆم بیبەم بۆ حەمام. حەمامی گشتی. کەس نەیئەزانی کچە. لاوازو ناسك بوو. ناچار بوو کە بۆ هەموو شوێنێك لەگەڵمدابێت و ناچار بوو کە گوێ لە هەموو قسەو باسو گفتوگۆیەکی من و هاوڕێکانم بگرێ. حەزی لە کتێب کردو سەردەمێ هات کە بە دزییەوە، بەبێ ئەوەی من بزانم ئەو کتێبانەی کە حەزیلێ دەکرد لە ژێر کراسەکەیدا دەیشاردەوە و دەیهێنایەوە بۆ ماڵەوە. من ئەو جۆرە خەباتکردنەم قبوڵنەبوو. بەڵێ، هەمیەش وابووە، مرۆڤ کاتێ کە پیر دەبێ و دەچێ بە ساڵا دیارە تازەکان قبوڵناکات یان بە ئاستەم ڕازیدەبێت پێیان. گەنجێتی و شەڕوشۆڕەکانی خۆی لە بیردەکات. کتێب و ئاوازو فکری نوێی بەلاوە سەیرە و لێیتێناگات. کوت و مت وەك ئەو کاتەی کە ئەو خۆی خەزی لەو کتێب و ئاوازو فکرانە بوو کە بەلای باوکیەوە سەیر بوو لێیتێنەدەگەیشت. پیاوەکە پرسی: "چووبوی بۆ دیداری؟" دوو جارچووبووم. لە دوایی بردنی دووجار چووم بۆ دیداری. قژی تۆپزی بڕی بوو. بە پەتێکی ڕزیوی وەك پەتی زیلۆ بەستبووی بە دزیەوە پیشانیدام. دەیزانی پێم خۆشە. دیاربوو دەیویست بمخاتەوە یادی مناڵی خوی. زۆر خۆشبین بوو بەوەی کە ئازادبێت، داوای قەڵەم بۆیەیی لێکردم: "نیگار دەکێشم بابە" دیداری دواتر کە چوومەوە بۆلای پاکەتێك قەڵەم بۆیەو دەستەیەك گوڵی نێرگزم بۆ برد. کە گوڵەکانی دی وتی: "لە دەرەوە پاییزە بابە؟" "زستانە ئازیزەکەم زستانێکی مێژوویی."

پێکەنی وتی: "باوەڕبێنین بەسەرەتای وەرزی سارد." پاشان قسەکەی گۆڕی: "دەمەوێ گوڵت بۆ دروستبکەم. ئەو گوڵەی کـــــە



حەزت لێیەتی." جاری دووەم کەدیم، دیسان بە ئەسپایی قژە تۆپزییەکەی پیشاندام وتی: "تابلۆکەم تەواو کردوە. ڕەنگە ئازادببم و لەگەڵ خۆم بیهێنمەوە. دوو گوڵی سوورم دروستکردوەو دەستەیەکیش گوڵی نێرگز لەلایدا. دەزانم زۆرت پێخۆش دەبێ." بەهیوا بوو ئازادبێ. خەریکبو سەبارەت بە بەرنامەو ئارەزووەکانی بۆ ئایندە دەدوا کاتی دیدار تەواو بوو." هەستاین و ڕۆشتین بەرەو لای جانتاکان.

ویستم جانتاکە هەڵگرم بەڵام نەمتوانی. وا دیاربوو کە لکاوە بە زەویدا. ئەو پیاوەش کاتی هەڵگرتنی جانتاکەی وەستاو وتی: "سەیرە! جانتاکان لکاون بە زەویدا!" "ئا! سەیرکە! پیشکەکان! یەعنی هەر بەم زووییە پیشکی سنەوبەرەکە چووەتەناو جانتاکە؟ یەعنی ئەم درەختە ئەوەندە تینوبووە؟!" پیاوەکە وتی: "ئێمە چەندین ساڵە لێرەدا دانیشتووین و قسە دەکەین. کات چ خێرا دەچێت." وتم: "ڕەنگە." جانتاکانمان لە پیشکەکان جیاکردەوەو بە ڕێکەوتین. ژنە کاتی خواحافیزی وتی: "خۆزگەیا دایک یاخوشکێکی دەبوو بگری بۆی." کاتێ کە دەگاتە ماڵەوە جانتاکە دەخاتە ناوەڕاستی ژوورەکە بە ئەسپایی و بە پارێزەوە دەیکاتەوە. لە پێش هەموو شتێ، تابلۆکە دەبینێ. دوو گوڵی سوور کە هەموو تابلۆکەیان پڕکردوەتەوە. لەلای تابلۆکەدا دەستەیەك گوڵی نێرگز وشکبووەو تاڵە پەتێکی ڕزیوی زیلۆکەوتووە. پیرەمێرد تابلۆکە هەڵدەگرێ. لە پڕ هێندەی ڕووبارێك گوڵی سوور لە تابلۆکەوە دەڕژێو و ژورەکە پڕدەکات. پیرەمێرد سەردەخاتە سەر شەپۆلی گوڵەکان و لە تاو ماندویی خەوی لێدەکەوێت. کۆتایی پاییزە. مانگی سەرماوەزە. پیرەمێردەکە دوو دەستە گوڵی نێرگزی کڕیوە گەڵا ڕەنگ پەڕیوو نیوە گیانەکانی درەختەکان، سەرتاسەری شۆستەکەیان داپۆشییوە. لەم لاولەولاوە دوو کەڵێکی تەنکو سەرگەردان لە کۆمای گەڵا وشکەوە بووەکان هەڵدەستاو دەچوو بە ئاسماندا. پیرەمێرد لەلای پەیژەی خۆڵەمێشی ماڵێکدا دەوەستێ. جەرەس لێدەدات. لەسەرەوە، لەسەر پلیکانەکەوە، ژنێ دەرگاکە دەکاتەوەو بە دیتنی پیرەمێردە دەڵێ: "ئا! پاییزە؟ نەخێر!" وە بە بێزارییەوە دەڵێ ئەمە دەیەم ساڵە کە بەتۆ دەڵێم ئەوان لێرە نەماون. دەساڵ لەمەو پێش نێرگزی کچی تیاچوو. ئەویش لێرە باریکردو ڕۆشت."

ژنە دەچێتە ژوورەوەو دەرگاکە دادەخات. پیرەمێرد گوڵە نێرگزەکان دەخاتە لای پەیژەکە. وەکو هەموو ساڵێکو وەك هەمیشە بۆ هەڵاتن لە دەست بای پاییز، سەریدەخاتە ناو یەخەی پاڵتۆکەی و پشتی کوڕ دەکاتەوەو دوو ردەکەوێتەوە.

ئەم چیرۆکە لە ژمارە 99–100 ی گۆڤاری (ادینە) دا بە ناونیشانی نێرگز لە سەرماوەزدا بڵاوبۆتەوە و دواتر نووسەر ناونیشانەکەی گۆڕیوە.

# قەڵەم قامیش



منداڵەکە دەمی چەقۆکەی لەسەر لاسکی قامیشە درێژەکە داناو زەختی خستە سەر دەسکی چەقۆکە هێشتا قامیشەکەی نەبڕیبوو بروسکێك بەسەردەمەکەی داخشاو گەڕایەوەو دای لە چاوی کوڕەکە. هەورە گرمەیەك شریخاندی. لەپڕ دەسڕێژێکی توندکرا بەناو قامیشەڵانەکەدا و دەموچاوی سافو جوانی گۆمەکەی پڕکرد لە ئاوڵە.

لە قامیشەڵانەکەدا گڤەی با دەهات و دەنگی وشکی قامیشەکان هەموو ئەوناوەی گرتبووەوە. لەتاوگرمەی هەورە تریشقەکە مراویەکان بەرەو قامیشەڵان هەڵهاتن. بچووکەکانیان لە ئاوەکەدا نقوم بونو ئیدی لە گۆمەکەدا بەدەرنەکەوتن. باران و لێزمەیەکی سارد گیانی گۆمەکەی کون کون دەکرد. تەمومژدەهاتە خوارەوە لێزمەو تەمومژ ئاسمانیان ڕەش دەکرد. منداڵەکە قامیشەکانی لەت لەت

بڕیـەوە. یـەکێك لـە قامیشـەکانی لەسـەرچاوی ڕاسـتی دانـاو لـە کونەکەیـەوە سـەیری ئەوبـەری گۆمەکـەی دەکـرد. لـەناو بازنـەی تـەمگرتووی قامیشـەکەوە چـەند ئۆتۆمبیلێکـی لەوبـەری گۆمەکـەوە دی. سێ جێبی خاکی وەستابوون. چەند کەسێ بارانی (مطری)ی ڕەشیان لەبەر دابوودابەزین. کڵاوی گەورەی بارانییەکانیان سەریدا پۆشـیبوون و تـەمومژ و لێزمـە نەیدەهێشـت ڕوخسـاریان دەرکـەوێ.منداڵەکـە بەنیگەرانیـەوە، بـەڵام وەك پوشـکە بـە قنگەیـەك خۆی گەیاندە پێشەوەو بە جوانی وێڵاییەوە لەبەینی قامیشەکانەوە سـەیری دەکـرد. ڕەشپۆشـەکان، کـە لێزمـەی بـاران دەموژاویـانی خەتخەتاوی کردبوو هەشت کەسیان لە جێبەکان دابەزاند. چاویان بە پـەڕۆی سـپی بەسـتبوون. لـە ژێـر لیزمـەی بارانەکـەدا، کـە شـێتانە دەباری، بە پەلە هـەموویانیان لـەلای یـەکدا ڕیزکرد. دەستی ڕاستی کەسی یەکەم بە باندج پێچرابوو. لە ژێر باندجەکەوە خوێن فیچقەی دەکرد. باندجەکە هەر لەو قوماشە بوو کە چاویانی پێبەسرابوو.با، سمێڵە ڕەشوونەرمەکەی دەئاڵۆزاند و دڵۆپی ڕوونی باران لە هـەردوو لاسمێڵییەوە دەتکا. ڕەشپۆشەکان بە پەلە لە هاتوچۆدا بوون. چمکی باندجـە درێژەکانیـان دەئـاڵا لـە قاچیـان. منداڵەکـە خوسـابوو. قامیشەکانی توند لەناو دەستیدا دەگوشی. بەبێ جوڵە وشکبوو لە جێگـای خۆیـدا. چـاوی بڕیبـووە ئـەو بـەری گۆمەکـە. جارجـار موچڕکەیەك سەرتاپای لەشی دەهەژاند. قەترە بلوورینـەکانی بـاران قـەد قـەد و تـوێ تـوێ ئاسمـانی کـەرتدەکرد و تـەمیش دەچـووە ناودرزی کەرتەکانەوە.

ڕەشپۆشەکان چەکەکانیان لە ژێر بارانیـەکانیان دەرهێنـاو لەسـەر ئەژنۆ دانیشتن. هـەموو ئـەو ناوە ببووە قوڕو چڵپاو، ئاوی گۆمەکە زیـادی دەکردو سـەردەکەوت. یـەکێ لەڕەشپۆشـەکان کاغـەزێکی لـە گیرفانی دەرهێناو بەزمانێ کە منداڵەکە تێنەدەگەیشت خوێندیـەوە: بەپەلەپـەلو نیوە و ناتـەواو خوێندیـەوە. کاغەزەکە خوسا، کرایـەوەو لکا بە دەستیدا، پیاوەکە بە ئەستەم کاغەزەکەی لە دەستی خـۆی کـردەوەو پارچـە پارچـە فڕێیدایـە سـەر عەردەکـە، بـەڵام یـەکێ لـە پارچەکاغـەزەکان نووسـا بـە چمکـی بارانیەکەیـەوە و لێینـەبووەوە. گرمەیەك دڵۆپە بلوورینەکانی لەرزاند. مراویەکان لە قامیشەڵانەکەدا دیارنەمان. کەسی یەکەم، ئەوەیکـە دەسـتی بـاندپێچکرابوو جـوڵاو مشتەقوچاوەکەی گوشی بە یەکدا. تەوژم و زەبری گوللەکان، کەسـی سێیەم و چوارەم کەمێرد منداڵو بڕێك ئەندام لاوازبـوون چـەند بستێ بەرزکرەوە بە ئاسماندا. لە دوورەوە شتێ تەقی و بارانێکی بە خوڕتر تێیکرد. مراویەکی ترساو لەلای قاچی منداڵەکەوە تێپـەڕی و بە پەلە سەریکرد بەناو چوڵکو چێوی کن قامیشەڵانەکەدا، بەڵام کلك و قاچە زەردەکـەی‌و پـەڕەکراوەکانی بـەدەرەوە مـابوو. لـەرزینی پـەردەکانی قاچی مراویەکە منداڵەکەی زیاتر ترساند. دوای گوللـەکان بێدەنگـی هـەموو ئـەو نـاوەی گرتـەوە. مراویـە ترسـاوەکە بـە زەحمـەت لـەناو چوکڵوچێوی قامیشەکان هاتەدەرەوە. بەڵام لەبەر دەنگی تەقینی ئەو گوللانەی کە لەمەودایەکی دیاریکراوەوە یەك یەك دەتەقین لە جێگای خۆی وەستا. سەرە بچووکو شینەکەی لەگەڵ تەقینی هەر گوللەیەکدا دەجوڵا. پشتەخەت خەتاوییەکەی کە دڵۆپە بارانی بەسەردا دەهاتە خوار، هەشت جار لـەرزی. بەپەلە خۆیکرد بە ناوەڕاستی ئاوەکەدا. باران خۆشی کردو تەمومژ نەما. منداڵەکە کـە هاتـەوە سـەر خـۆی. واقـی ورمـابوو. لـەتاو سەرماسـڕیبوو. هەسـتیکرد پێویسـتی بـە هەتاوێکی گەرم هەیە وەك هەموو ڕۆژەکان چاوەڕوانبوو تاوەکو خاڵۆ سیاوەشی دراوسێیان بێت بۆ قامیش بڕین. خەریکبوو دەموچاوی بە پشـتی دەسـتی و چمکـی پاڵتاوەکـەی وشـك ئـەکردەوە کـە لـە دووورەوە گوێی لە دەنگی خاڵۆبوو.

:"ئەهای... هۆوو.. هۆوو.. هۆوو!"

منداڵەکـە دەنگـی دەلـەرزی، بەپەشـۆکاویی و لاڵەلاڵـەوە وەڵامیدایەوە:

"هۆوو.. هۆوو... هۆوو...!"

پاشکەمێ خاڵۆ سیاوەش لەناو قامیشەکانەوە هاتـەدەرەوە، لـە بەردەم ئەودا وەستاو سەروێنە تەڕەکەی کردەوە کە بیگوشێت.

"چ تۆفانێکە! چ ڕۆژێکی ناخۆشە! لە خۆڕا هاتووین."

منداڵەکە چاوە قورس و زاقەکەی بڕیە گۆمەکە.

"زۆر خێرا هاتن، دەسرێژیانکرد. ئالەوێدا..."

-قەیاناکا تازە تائێرە هاتووین باشترە دەست بەکارین.





کۆکەیەکی کردو بەرەو قامیشەڵانەکە ڕۆشت پێڵاوە لاستیکەکانی دەسرپی بە سەر قوڕ و چوکلو چێوە ڕزیوەکاندا: "لە پێش هەموو شتێکدا ئەبێت ئاگر بکەینەوە. ئاگر." بە زەحمەتێکی زۆر ئاگرێکیان کردەوەو دانیشتن لەلایدا. هەڵم لە جلەکانیان هەستا. خاڵۆ لێواری چەقۆکەی خستە سەر نینۆکی، مناڵەکە بە دەستە لەرزۆکەکانییەوە ئاماژەی کرد بۆ ئەوبەری گۆمەکەو بە ترسو لەرزەوە وتی:

"لەوێ، پشت قامیشەڵانەکە."

خاڵۆ سەیرێکی ئەوبەری کرد:

"ها، چی بوە لەوێ؟"

... لەوێ ڕاوچییەکان زۆریان کوشت.

خاڵۆ ڕامایە ڕوخساری مناڵەکە.

"بۆچی ڕەنگت وەك قوماش زەرد بووە، وەرە پیشانم بدە.

چی بوە براکەم؟" کاتێ کە گەشتنە ئەو جێگایەی کە مناڵەکە ئاماژەی بۆ کردبوو جۆگەلەیەك لە خوێن و باراناو بە ژێر پێیاندا دەڕۆشت. خاڵۆدانەویەوە:

"ڕاوچییەکان، بەم بەیانیە زووە؟!"

مناڵەکە لەرزگرتوو: "دەنگی گوللە هات... دەسرێژ! مراویەکان زۆر ترسان. ئەوان..."

—بەدڵنیاییەوە لە کەڵە کێویەکانیانداوە. ڕانێکی زۆر!

مناڵکە هێشتا مات بوو.

"هەشت دانەبوون."

—کێ؟

—کەڵەکێویەکان! ڕەنگە خەوم دیبێ.

چاوە تاگرتوەکەی هەڵگلۆفی: "بەجۆرێ قسەی ئەکرد تێنەئەگەیشتم." خاڵۆ لەسەر ئەردەکە دانیشتوو دەستی خستە قوڕەکەو تێکیدا: "ئەمانە جێگا پێی ئادەمیزادن. زۆر بوون. جێگاپێی کەڵەکێویەکانیان تێکداوە." بە پەنجەی ئاماژەی شتێکی سپی وەك لۆکەی نەرم و گەچی کوشتە لەناو جۆگەلە خوێناوەکەدا دەرهێنا.

"لە نزیکەوە گوللەیان داوە لەسەریان!"

کەمێ بیری کردەوەو ڕامایە قامیشەڵانەکە: "غافڵگیریان کردون"

مناڵەکە وتی: "ڕەنگە"

هەردووکیان یەکی بە باوەشی قامیشەوە گەڕانەوە بەرەو لای ئاگرەکە کە خەریکبوو ئەکوژایەوە. خاڵۆ دەستی کرد بە دروستکردنی جوزەلەو مناڵەکەش سەروخواری ئەو قامیشانەی کە پێشتر بڕی بوونیەوە ڕێکوپێکی کردن و خستنیە ناو تورەکەکە خاڵۆ بەووردی سەیری یەکێ لە قامیشەکانی کرد: "سەیرکە! پەڵە خوێن کەوتووەتە سەر قامیشەکان."

مناڵەکە قامیشەکانی لە دەستیدا ەسووڕاند: "نەنکم دەیوت هەرکاتێ هەورە گرمە لە قامیشەڵان بدات، قامیشەکان پڕدەبن لە پرشی خوێن." —ڕاستە، منیش بیستوومە.

چلۆسکێکی هەڵگرت. هێدی هێدی فوی لێکرد تا گڕی گرت. تاوەکو مەودایەکی دیاریکراو دیوە سافەکەی قامیشەکانی سوتاند و ڕیزێك کونی تێکردن. دوو دانە لە قامیشە کونکراوەکانی خستە لای یەکەوەو بە پەتێکی مۆماوییەوە توند بەستنی بەیەکەوە، پاشان دوو قامیشی کورت وباریکتری بە چەقۆ هەڵدڕی و کردنی بەسەری دوو قامیشەکەی تردا و لەسەرخۆ وتی: "جووزەلەیەکی باشیلێدەرچوو." دەستی بەسەر ئاگرەکەوە گەرم کردەوەو سەروێنەکەی کە هێشتا شێیتەڕی هەبوو، بە ستی بەسەرەوەو جووزەلەکەی نا بە لێویەوە. جووزەلەکە هاواری لێهەستاو نالاندی لەپڕ بێدەنگی گۆم و قامیشەڵان و جیهانی گرتەوە. تاوەکو دەنگی جووزەلەکە بگاتە هەموو جێگایەك: "لێدە جووزەلەژەن لێدە جووزەلەژەن"

—جوانی دەژەنی لێدە جووزەلە ژەن.

—لێدە لە کۆڵانان و لە بازاڕ

—ئێمە یان کوشت لە قامیشەڵان.

خاڵۆ بە پەلە جووزەلەکەی لابرد لەسەر لێویو لە مناڵەکەی پرسی "کەسی لە قامیشەڵانە دوورەکانەوە گۆرانی دەڵێ. گوێت لێیە؟"

مناڵەکە بەسەرسوڕمانەوە ڕامابووە خاڵۆو وتی: "خۆت بوویت گۆرانیت دەوت خاڵۆ!"



—من.. من بەس جووزەلەم ژەند. بەووردی سەرنجی جووزەلەکەی داو ئەم دیو ئەودیویکردو دووبارە خستیەوە نێوان لێوی.

"لێدە جووزەلە ژەن لێدە جووزەلەژەن"

—چ جوانی دەژەنی، جووزەلە ژەن

—لێدە لە کۆڵانان و لە بازاڕ

—ئێمەیان کوشت لە قامیشەڵان.

خاڵۆ خێرا جووزەلەکەی لە گیرفانیدا شاردەوە:

"بەڵێ، ڕاستە. کەسێ لە دوورەوە هاوکات لەگەڵ جووزەلە ژەندنەکەی مندا گۆرانی دەڵێ. دەنگی چ خەمگینە."

*　　*　　*

ڕۆژی دواتر منالەکە قامیشەکانی برد بۆ ماڵی مامۆستاکەی و لە بەردەمیدا داینا. مامۆستا سەیری چاوە سوورو تاگرتوەکەی منالەکەی کردو دستە نەرمو ناسکەکەی گرت: "کوڕە بچکۆلەکەم تات هەیە ئاگر لە دەستت دەبارێ." منالەکەلەسەر خۆ وتی:

"دوێنێ ڕۆشتم لە قامیشەڵان قەڵەم قامیش ببڕم. لەناو هەورە گرمەو لێزمە و باراندا گیرم خوارد."

مامۆستا سەرێکی لەقاندو سەرباسی بابەتەکەی بۆ منالەکە نووسی:

"ئەمەش سەرباس... چەند ڕۆژ لە ماڵەوە بمێنەرەوە تاوەکو چاکدەبیتەوە خۆت خەریکبکە بە مەشقەکانتەوە."

منالەکە حەفتەیەك لە ماڵەوەمایەوەو لە تاو گەرمی تاکەی دەسوتا. کە حاڵی باشبوویەوە هەروا کە لە جێگاکەیدا ڕاکشابوو، وانەکانی نووسی و هەر کەتەواویکرد، چوو بۆ لای مامۆستاو دایە دەستی.

مامۆستا بە دیتنی خەتەکەی سەری سوڕماو پێیسەیر بوو:

"شاکارتکردووە کوڕم. ئەمانە... تۆ ئەم خەتانەت نووسیوە؟!"

گوێی ناسکی منالەکە شینبویەوە: "بەڵێ مامۆستا."

مامۆستاکە بەسەرسوڕمانەوە چاوی بەسەر کاغەزەکەدا دەگێڕا بەنێو چاوانێکی گرژەوە وتی: "بەڵام... ئەمە.. ئەو سەرباسانەنیە کە من بۆم نووسیت. ئەمانەت لەکوێ..؟"

وە بە چاوانی تەمگرتوەوە سەیری لاپەڕەکەیکرد:

"چەندین جار جار جار لە خوێنیان گەوزاندین.

بیهێنەوە یادی خۆت خۆت خۆت

وە تەنیا دەستکەوتی کوشتار کوشتار کوشتار ر ر ر ... نانەڕەقەیی خوانییی بێ پیتی پیتی پیتی ئێمە ئێمە ئێمە بووو."

مامۆستا لەپڕ تووڕەبوو: "من پێموتبووی هیچ کاتێ بەدەم تاوە نەنووسی." منالەکە بە کزۆڵییەوە وتی: "حاڵم چاکبوو مامۆستا. چاکبووبومەوە." مامۆستا هاواریکرد: "تاووڕێنە!"

منالەکە بیری لە لەرزینی پشتو پەڕەکانی قاچی مراویەکە ئەکردەوەو وتی: "مامۆستا بەخوا حاڵم زۆر باشبوو. تەنیا کەمێ حاڵی.. حاڵم... ڕەنگە..."

ڕووخساری منالەکە هێندە پاك و بەری بوو دڵی مامۆستاکە نەرم بوو سەیری نووسراوەکانی کرد. مامۆستا گوێی لە دەنگی جوزەلەیەکی دووربوو. ئەڵێی هەموو باڵندەکانی جیهان لەگەڵ ئاوازی جوزەلەکەدا گۆرانی دەڵێن: "لێدە جووزەلە ژەن لێدە جوورەلەژەن چ جوانی دەژەنی جووزەلە ژەن

لێدە لە کۆڵانان و لە بازاڕ

ئێمەیان کوشت لە قامیشەڵان."

مامۆستا بەبیستنی گۆرانییەکە خەمدایگرت:

"ناچارم دووبارە سەرباست بۆ بنووسم. قەڵەم قامیشەکەتم بەرێ!" منالەکە قەڵەم قامیشەکەی دا بە مامۆستا، مامۆستا دانەویەوەو دەستیکرد بە نووسین. کەتەواو بوو سەرباسەکەی خستە بەردەم منالەکە: "بەدەنگی بەرز بیخوێنەوە بۆم."

منالەکە بە دەنگە ناسك و خۆشەکەی دەستوخەتی مامۆستاکەی خوێندەوە: "من باکم نییە.

ئەگەر ئەم خەیاڵە لە خەونی ئاڵۆزی شەوێکدا تێئەپەڕێ."

مامۆستا هاواریکرد: "ئەو سەرباسەی کە من بۆم نووسیوی بیخوێنەرەوە نەك ئەوەی خۆت!"

منداڵەکە لە ترسا دەلەرزی: "ئەمە.. ئەمە... سەرباسی خۆتە مامۆستا"

مامۆستا بە تووڕەییەوە کاغەزەکەی لە منداڵەکە وەرگرتو بە دیتنی دەستوخەتەکەی خۆی حەپەساو چاوی بڕیە قەڵەم قامیشەکە کە بەدەستیەوە دەلەرزی:

"ئەم قەڵەم قامیشە! بە پرشی خوێن!"

منداڵەکە چاوە تاگرتوەکەی بڕیە نیگاری باڵندەکە ڕەنگەکەی ناو گلێمی ژوورەکە: "نەنکم دەیوت هەرکاتێ هەورەگرمە لە قامیشەڵان بدات، قامیشەکان..."

منداڵەکە وتی: "تام هەبوو. بەدەست خۆم نەبوو هەروەك... قەڵە قامیشەکە خۆی دەخشا بەسەر کاغەزەکەدا."

مامۆستا چاویلکەکەی بەسەر لوتیەوە جولاند و سەیری نووسینی منداڵەکەی کرد: "من باکم م م نی یە یە یە ...

ئەگەر ئەم خە خە خەیاڵە لە لە لە خەونی نی نی ئاڵۆزیەی شەوێکدادادا تێپەڕیێێ.

یا بەوڕێنەی تایەك ك ك ك ...

یا بە چاوی بەخەبەرەوە وەوەوەوە...

یا بەگیانی نەیەی خەمبارر..."



# دەنگی شکانی ڕووناکی



لەتاو هەنسکی گریانێ خەبەری بۆوە. وایزانی خەو ئەبینێ کە کەسی ئەگری. ترس و نیگەرانیەك کەوتە دڵی. بە خۆی وت: "خۆزگە خەوم ئەدی" بەڵام خەوی نە ئەبینی ئەوە دایکی بوو کە عەباڕەشەکەی دابوو بە سەروچاویداو لەلای دیواری خانەقاکەدا سەری نابوو بە دیواری خانەقاکەوەو دەگریا.



کوڕەکە مێرد منداڵ بوو. سەری نابوو بە پشتی دایکیەوە و لەلای دانیشتبوو. سێ منداڵەکە بچوکتر بوون، لەلای دایکیاندا لە ژێر ئەو بەتانییەی شەوی پێشوو میجێوری خانەقاکە پێی دابوون پرخە پرخیان دەهات. بەبڕێکی دڕندە لە سوچێکی بەتانییەکەوە چنگ و ددانی نیشان ئەدا.

بەپشتی دەستی چاوی هەڵگلۆفی. دەمی وشك ببوو. تینوی بوو، تازە کەوتەوە بیری کە لەماڵی خۆیاندا نییە. ماوەیەك لەناو خۆیدا، لەولاو لەولای زەینیدا بەدوای شتێك گەڕا تا دۆزییەوە؛ هەستی ترسێکی ون لەگەڵ نیگەرانی و نا ئومێدی. لەژێر گلۆپی ژێری ناوەڕاست خانەقاکە پەپوولەیەکی سەر گەردان بەدەوری خۆیدا دەسووڕایەوە. دووبارە سەری نا بە پشتی دایکیەوە، چاوانی لێکنا بۆ ئەوەی بخەوێ، بەڵام نەیتوانی. ماندوویی و گولاوی کۆنی ڕۆژانی ڕابردووی عەباکەی دایەی بۆنکرد. خانەقاکە ڕووناك بوو، بەتانیەکە

لەسەر قاچی یەکێك لە براکانی لاچووبوو. دووبارە بەسەر قاچیدا دایەوە. بەبرەکە بە چنگە تیژەکانیەوە کەوت بەسەر منالەکاندا. بە هێواشی هەستاو چوو بۆ حەوشەکە کزەی سەرماکەوتە گیانی. گەڵایەکی لاسارکەتا کۆتاییەکانی پاییز هەر بەدارەوە مابۆوە لەژێر قاچیدا وردبوو. بەرەو حەوزە گەورەکەی ناوەڕاست خانەقاکە ڕۆیشت. ئاوەکە ڕوون بوو.

ماسیەکی چکۆلە سەری نابوو بە بلقی سەر ئاوەکەوە و دەیمژی. ئاسمان ساف بوو. چەند ئەستێرەیەك لە ڕووناکی حەوزەکەدا دەلەرزین. لای حەوزەکە دانیشت و دەمی نا بە ئاوەکەوە و لە پەنا ئەستێرەکانەوە خولایەوە، بە هێواشی دەستی خستە ناو ئاوەکەوە، ئاوەکە لەرزی. ماسیە سوورە چکۆلەکە وازی لە بلقی سەر ئاوەکە هێناو بەرەو لای دەستی کوڕەکە هات. ئێستاکە دەستی ئەو لە ئاوەکەدا شکابوو ماسیە سوورەکە وەك پەڵەیەکی خوێن هاتبووە سەردەستی.

"دەستی باوکم"

لە دوورەوە دەنگی سینگ کوتان و شین و واوەیلا دەهات: "عەباس شێری" لانەی ئازایەتی/ کەساس نەبوو/ ڕووبەڕووی مەرگ بوویەوە/ گیانم بە قوربانی عەباس/ گیانم بەقوربانی عەباس."

باوك ماندوو ڕەنگ پەڕیوو وەستابوو. پاسەوانەکان لەمبەرەوە گرتبوویان. کوڕەکە کەوتەوە بیری کە دایکی شتێکی لە باوکی پرسیبوو باوکی هێشتا قسەکەی تەواو نەبووبوو کە پاسەوانەکان داباریبوونەسەری. منالەکان بە ترسەوە نووسابوون بە دایکیانەوە و بەدەم لەرزینەوە گریابوون و قیژاندبوویان: "دایە بڵێ لە بابە نەدەن، بڵێ بالێینەدەن"

"عەباس شێری لانەی ئازایەتی/ کەساس نەبوو، ڕووبەڕووی مەرگ بوویەوە/ گیانم بە قوربانی عەباس/ گیانم بەقو..."

"بڵێ با لە بابە نەدەن دایە بلی لێی مەدەن"

پاسەوانەکان مندالەکانیان کردبووە دەرەوە. دایکیان کەوتبووە سەرزەوی و لەهۆشخۆ چووبوو. باوکیان هێشتا هاواری دەکرد. دەنگی هاوارو ناڵەناڵێکی ترسناك دەهات. ماوەیەك چاوەڕوان بوون، گریان، دایکە منالەکانی ئارام کردەوەو بە عەباکەی فرمێسکەکانیانی سڕی.

دڵنەوایی هەموویانیداوە: "ئازیزەکان مەترسن، دایکتان بمرێ بۆ ئەو ڕەنگە پەڕیوەتان. مەگرین ڕۆڵە"

منالەکان بە ترس و لەرزەوە بە دەوری دایکیاندا کۆببوونەوە. دیسان داوایان لێکردبوون بچنە چووری دیدار. باوك، دەستە لەرزۆکەکانی بەرەو ژن و منالەکانی درێژ کردبوو. کوڕەکە دەستەکانی بابی ماچ کردبوو. دەستی کوڕەکە لە ڕووناکی ئاوەکەدا شکابوو. ماسیە سوورەکە وەك پەڵە خوێنێك بەسەر دەستیەوە دەجولا. شەو زرنگابۆوە.

دایك وتبووی: "لەم شارە بی سەرەوبەرەدا، بۆ کوێ بڕۆین، پەنا بۆکێ بەرین؟" ئەوەی لە هەموویان بچووکتر بوو وتبووی: "دایە خەفەت مەخۆ و مەگری. با گەورەبم نایەڵم ئازارت بەن ئێستا هەستە با بڕۆین بۆ پارك و یاری خش خشێن بکەین" دایك دەستی هێنا بە سەریدا" ئازیزەکەم پەنا ئەبەین بۆ ئیلام زادە سالح. شەو لەوێ بەسەردەبەین تا بزانین چۆن دەبێ" لە سوچێکی خانەقاکەدا دانیشتبوون. دڵشکاو و خەمبار دایك سفرەکەی ڕاخستبوو لە بێدەنگیدا ئەو نان و شفتەیەی دایکیان لەماڵەوە لەگەل خۆی هێنابووی خواردبوو. سفرە بیانوویەك بوو بۆ ئەوەی سەیری یەك نەکەن.

سەریان داخستبوو. شتێك لەناخیاندا شکابوو. "کاتێ ڕووناکی لەناو ئاودا دەشکێ بۆ کەس دەنگی شکانەکەی نابیستێ؟" کوڕەکە بیری کردەوەو لە پڕ کەوتەوە بیری باوکی کەوتبووی: "دەم لە خواردن نادەم بەشکەم کەسێ بە هانامەوە بێت" دایك سفرەکەی کۆکردبۆوەو ڕۆیشتبوون لەبەلوعەی حەوزەکە ئاویان خواردبۆوە. دایك لە سوچێکدا کزەڵەی کردبوو. منالەکانیش سەریان خستبووە سەر قاچی. یەکێ لە منالەکان پرسیبووی:

"دایە ئەو پیاوانە بۆچی دایان لە باوەم؟ یەکێکی کە لە منالەکان پرسیبووی: "بۆچی باوکم دەستی دەلەرزی؟ بۆچی دەستی شکابوو خوێنی لێ دەهات؟" منالەکە لێوی هەڵقرچاند بوو بە نارەزاییەوە "ئەی بۆ بابە ڕەنگی پەڕیبوو؟ بۆچی هاواری دەکرد؟ منالەکەی لە هەموویان بچووکتر بوو وەلامی دابوویەوە: "مەگەر لەبیرت نییە لە تەلەفزیۆندا لە کەسێکیان دەدا بەلام کاتێ کە فیلمەکە تەواو بوو هەر کەسەو ڕۆیشتەوە ماڵی خۆی و هیچ کامێکیان هیچ شوێنێکیان بریندار نەبوو. پاشانیش ئەوەی کە لە فیلمەکەدا لێدانی خواردبوو لەگەڵ منالەکانی ڕۆیشتن بۆ پارك، دەنانا؟"

وەلامی وەرگرتبووەوە کە: "باوکی ئێمە لە فیلم دانەبوو خودی خۆی بوو" کوڕەکە پرسیبووی: "دایە ئەتەوێ چی بکەی؟ چارەنووسی بابە چی لێدێ؟"

دایك وتبووی: "نامە دەنووسم بۆ سەرۆك کۆمار داوای لێدەکەم بێ بە هانامانەوە"

منالەکە زۆر بە خۆباوەڕییەوە وتبووی: "دایە بۆ سەرۆك کۆمار بنووسە کە ئەم "ئینسی"یە، کچی دراوسێکەمان، سی ڕۆژە بێچوە پشیلەکەی ئێمەی بردووە و نامانداتەوە" کوڕەکە وتبووی: "دایە هەموو شتێ بنووسە. بنووسە خاڵە سمایل لەبەرەکانی شەڕدا شەهید بووە، بنووسە باوکم و باوەگەورەم و مامەکانم هەشت ساڵ لە بەرەکانی شەڕدا بوون، بنووسە بابە چەند جار بریندار بووەو فێی لەگەڵە. بنووسە نەنکم نەخۆشەو هەرناوی بابە دێنێ و داوای دیتنی دەکات. بنووسە ئەوانە چۆن دایان لە باوکم"



ماسیە سوورەکە لە سەردەستی کوڕەکە دەجولاّ: "دەستەکانم چەند لە دەستی بابە دەچیّ. نینۆك پەنجەکانم کتومت لەو دەچیّ" دەستە ساردو سڕەکەی لە ئاوکە دەرهیچناو بە سوچیّکی چاکەتەکەی وشکی کردەوە. سەیری ئاسمانی ڕەش و تاریکی کرد. ترس و نیگەرانی هیّشتا لە ناخی دابوو. دەستی کرد بە ناودەمیدا و هەناسەی داو بە هەڵمەکەی نووکی پەنجە ساردو سڕەکانی گەرم کردەوە. هەموو جیّیەك بیّدەنگ بوو، دەنگی سنگ کوتان و لە خۆدان زۆر دوورکەوتبۆوە... گەلاّ وشەکە سەرسەختەکە بەولاولادا دەڕۆیشتو بە هیّوری دەینالاّند. گەڕایەوە بۆ خانەقاکە.

پەپوولەکە، لەژیّر ڕووناکی گڵۆپە شیریەکەدا بەخیّرایی بەدەوری خۆیدا دەسووڕایەوە. لەلای دایکی دانیشتو سەرینا بە پشتیەوە. لە بۆنی ماندوویی و گولاّوە ناموکەیدا نغرۆ بوون گویّی لیّبو خەودا وشەگەلیّك دەڵیّ: "قوم الظالمین.. قوم الظا..."

# سەعات



چنارەکان سی جار گەڵاکانیان زەرد هەڵگەڕاو سی جار بەفرو سەرما دای لە لەشە ڕووتوقوتەکەیان. پیاوێکی سی و شەش ساڵان لە تەینشت پەنجەرەیەکدا وەستاوە و سەیری شووشەی دەرگایەکی نیوە ئاواڵا دەکات. باوکی لەوێیە. هاوتەمەنی ئەوبوو. کوت و مت هەر خۆیەتی. قژی برۆکانی، پەنجەرەکە سەردەردێنێ. شەش نهۆم دوور لە شەقام، دوور لە لێوە لێکنراوەکانی، لوتە بچووکەکەی و سمێڵە گەورەو پانەکەی کە تازە مووی سپی تێکەوتبوو. لە جادەی قیرتاو. دوور لە چیمەنی چنارەکان. چنارەکان بەقەد چوار نهۆم هەڵچون. ترۆپکی درەختەکان ئەبینێ بە دەم شنەباوە شەپۆل دەدەن و لقە بڵندو ناسکەکانیان بەرگەی قەلەڕەشەکان ناگرن و لەسەر خۆ دەچەمێنەوە. ئەو ڕۆژانە، نەمامەکان کورت و ناسکبون کە بە پیکابێکی شارەوانی هێنانیان و لە چاڵی کن شۆستەی



جۆگەلە ئاوەکاندا ناشتنیان. کە لەلایانەوە تێئەپەڕی، بەدەستە بچکۆلەکانی لەسەرخۆ ڕایدەوەشاندن. باوك ئەیوت: "کوڕم وریابە، ڕیشکەکەی دەردێو وشك ئەبێ. هێشتا خۆیان نەگرتوە." هەر ئەمڕۆ دایەیان بە خاکسپارد. دوور لە زێدی خۆی کە هەمیشە هیوای ئەوە بوو بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، هەمیشە خەوی بە باخە گوێز و بەڕوەکانیەوە ئەدی، هەمیشە ئاوازە تاڵوشیرینەکانی لە ژێر لێوەوە دەوتەوە: "وەرە بادیسان بناغەی هاوڕێیمان دامەزرێنین."

—من ئەبمە داری نارنج و تۆش داری لیمۆ.

دایە سیساڵ لەدوای بابە مایەوە و سی جاری تر زەردبوونی گەڵای چنارەکانی دی. چەند هاوڕێیەکی کۆنی بابە هاتبوون بۆ پرسە. نووسەرێکی پیریشیان لەگەڵدابوو ئەوی ماچکردو وتی:

"کوت و مت لە باوکت دەچی ... بەڵام..."

—بەڵام چی مامەگیان

—وەك تۆ دووره پەرێز و پەشێو نەبوو. سەراپا زەوق و هیوابوو.

—تەنانەت ئەو ساتەش کە کەوتبووە لای نەمامە چنارەکان؟ نووسەرە پیرەکە وتی: "پێکەوە لە بەندیخانە ئازاد بووبوین. لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی هاتبوون بۆ دیتنم. دیارییەکیان بۆ هێنابووم. پەنجا پێنووس و سەد دەفتەری سەد لاپەڕەیی.

—پێشتر ئەمەم بیستبوو.

—کاتی کە دیاریەکەی داپێم وتی: بنووسە لەبارەی ئەو هەموو بەڵانەی کە بەسەرماندا هات، وتم بەسەرچاو کاکە گیان لەبەر تۆش بێت دەنووسم. لەلای پەنجەرەی ژوورەکەدا وەستاوەو سەیری وێنەکەی خۆی

دەکات. سەردەردێنی و سەیرێکی شەقامەکە دەکات. گوێی لە دەنگی دایە دەبێت: "سیروان کورم سەرت بەرەناوەوە! لێتدەدەن." خۆی لادەدات. دایە بەرەنگی پەرپو بە ترسەوە چاو دەبرێتە بابە. بابە گوێی ڕاگرتووە لە تەپەی ئەو پۆستالانەی کە بەر قادرمەکانی ئەو بینایە دەکەون. ئاسانسورەکە بەهۆی نەبوونی شتومەکی ئەحتیادەوە کارناکات و ئەوانیش خەریکن بە سەر قادرمەکاندا دێنە سەر. بابە دەیەوێ لەسوچێکی پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە بکات. گوللەیەك ڕێك لە بەرامبەر پەنجەرەکەوە تێدەپەرێت و کەمی لەولاترەوە بەردیواری مالێ ئەکەوێ. ژنە ئەقیژێنێ: "سیروان ڕۆڵە، وەرە ئێرە دانیشە." بابە دەڵێ: "تەنیا ئەو ماڵەوە ئەزانی." دایکە ئەپرسێ: "دوێنێ بۆ کوێ چویت؟"

"چوم تەلەفون بکەم."

—کەس بەدواتەوە نەبوو؟

—نەء

—دڵنیایی

—بەڵێ

—نەچوی بۆ جێگایەکی دی؟

—نەء، بەس بەڵێنم لەگەڵ ئەمین هەبوو. لە چەند شەقامێك خوارترەوە تەلەفونم کرد.

—تەلەفونەکەی هەڵگرت، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە.

—ڕەنگە خۆی لە ماڵەوە نەبووبێت.

—نازانم. دەبو قسەیەك بکات نەیکرد منیش خێرا تەلەفونەکەم دانا.

—پاشان چیتکرد؟

—گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. بۆ ئەوەی ڕێگاکەم بگۆڕم لە چەند کۆلان خوارترەوە گەڕامەوە. هیچ باسێ نەبو دۆخێکی ئاسایی بوو.

ژنە چوە پشت دەرگاکەو دەستی خستە سەر کێلونەکەی. پیاوەکە وتی: "دەستی لێمەدە"

ژنە وتی: "ماڵەکە کەشف بووە. هەر بەم زووییە."

—کێبڵ و پێست و ئێسقان.

کاك ئەمینی دی بە گاگۆڵکێ بە بەردەمیدا تێپەڕی. دەوروبەری پڕبوو لە ددان و نینۆك خوێن. لەگەڵ دەنگی ژنەکە کاك ئەمین دوورکەوتەوە "بەڵام ئەو هەمیشە چەکی پێبووە." پیاوەکە چاوی بە دوای کاك ئەمیندا دەگێڕا تا لەناو ئەو تەمە سوورەدا بیدۆزێتەوە: "هەندێ جار گولله گیر ئەکاو جگە لەوەش..."

—جگە لەوەش چی؟

—ژیان خۆشە سەیری چنارەکان کە چۆن بەزەوقوخۆشییەوە بەرەو هەتاو هەڵئەکشێن. سەیری قەلەڕەشەکان بکە بە چ زەحمەتێك بەسەر درەختە دوورەکانەوە لانە دروستدەکەن.

—یەعنی کاك ئەمین!



—تەنانەت خۆیشم.

بە ئەسپایی و بە گاگۆڵکێ بەرەو پەنجەرەکە ڕۆشت و بە پارێزەوە سەری لە پەنجەرەکەوە بردە دەرەوە. سێ جێبی خۆڵەمێشی سەقف شەترەنجی ڕەشوسپی لەوێدا وەستابوون.

پیاوەکە لەسەر ئەردەکە خۆیی ماتکردوو وتی:

"دەمار و پێست و کێبلۆ ئێسقان و ئاسن."

منالکە تروسکەیەکی خێرای لە چاوەکالەکانی باوکیدا دی. دەماری نێو چاوانی دەرپەڕیبوو. ژنە سوراحیەك ئاوی لەسەلاجەکە دەرهێناو پەرداخەکەی پڕکرد، دەستی دەلەرزی، پەرداخەکە پڕبوو دەستی تەڕکرد. پەرداخەکەی دا بەسیروان: "بخۆ... ڕەنگت وەك گەچ سپی بووە." هێشتا هەست بە فێنکی ترساوی ئاوەکە دەکات لەگەرویدا. سێ جار درەختەکان ڕووت و قوت بووبوونەوەو لەشە ڕووتەکەیان لە بەفرو سەرمادا لەرزگرتبووی. سێجار قەلە ڕەشەکان لە هێلانە تازەکانیاندا هێلکەیانکردبوو. ئێستا نەیدەزانی وێنەی خۆی دەرچووە لسەر شوشەی پەنجەرەکە یاهی باوکی، هەر لەو سەرەوە چاوی بڕیبووە ئەو پەڵەیەی سەر قیرتاوەکە کە دوور ئەکەوتەوە لێی. لەلای ئەو سێ جێبە خۆڵەمێشییەدا.

"ئاخ بابە گیان!"

ئەوهاوارە کێ بوو؟ چاوی بڕیە شووشەی پەنجەرەکە. خۆی بو یا باوکی؟

دەنگی لەمنالێکی شەش ساڵان دەچوو ك تازە لە قوتابخانەکەی نزیك مالی خۆیان ناونوسکرابێ و مانگێکی تر دەچێت بۆ

قوتابخانە. جانتایەکی جوانیان بۆ کڕیبوو، بابە بەڵێنی پێدابوو کە قەڵەم و دەفتەرو قەڵەم دادەریشی بۆ بکڕێت.

بابە دوور و دوورتر کەوتەوە. تا بوو بە پەڵەیەك بەسەر قیرتاوی لای چنارەکانەوە.

"ئاخ بابە گیان"

لــە پشــت دەرگاکــەوە دەنگــەدەنگ و هــەرا و هوریــا بــوو. لەناوەڕاسـتی موبەقەکـەدا، کتێبـەکان، نامیلکـەکان، قەباڵـــــەو بەڵگـەکان دەسـووتان. دایـك دەسـەپاچە بـە گاگۆڵکـێ بـە دەوری ژوورەکەدا دەخولایەوەو بۆ ئەوەی نەقیژێنێ تاکە گۆرەویەکی ئاخنی بووە دەمی خۆی. ژنە لە پڕ تاکە گۆرەویەکەی لە دەمی دەرهێنا: "چیبکەین؟"

تۆگیانی خۆت و سیروان. مناڵەکەم بە تەنیا بەجێ مەهێڵە.

خۆت هەر چۆنێك پێت خۆشە بژی، بەڵام مناڵەکەم بەجێ مەهێڵە.

—بۆچی تۆ لەگەڵ ئێمە نایەی؟

پیاوەکـە چـوە پشـت دەرگاکـە. خـەریکبوون بـە قۆناخـە تفـەنگ دەرگاکـە یـان ئەشـکاند. لـەپڕ پیاوەکـە گەشـایەوە. ڕووخســاری لەسەرخۆ و ڕووناك بـوو. دەمـاری نێـو چـاوانی هـەڵا ئاوساوتر لـە هەمیشـەو چاوە کاڵـەکانی لـە هەمیشـە تروسکاوەدارتر بوو. ڕایکـرد بــەرەو لای پەنجەرەکــە. بــە خــێرایی لــە فــەزای بــەتاڵی تــاکی پەنجەرەکـەوە فـڕی. سـیروان بـاوکی دی کـە سـەیری ئـەمی دەکـرد، دەست و قاچی کراوەتەوە چووە خوارەوە. لە نیگایدا شتێکی سـەیر و سەمەرەو پڕ لـە نهێنی هـەبوو هێشتا لـە دوای سـی جـار ڕووت و قووت بوونەوەی چنارەکان تێناگات لەمانایان. بابە خەریکبوودەچوە خوارەوە. حـەزیدەکرد وەك فیلمـەکان دووبارە بگەڕێتـەوە بـۆ دواوە. بێتە سەرێ و لەبەر پەنجەرەکەدا دانیشێ.

ئێستا خەریکبوو بابەی ڕادەکێشایە سەرەوە. هـەر بـەو دەست و قاچە کراوەیـەوە لـەو ئاسمانـەدا. ئـەوی هـەر بـەچاوە کاڵەکانییـەوە هێنایـەوە بـەر پەنجەرەکـە. لـەو ڕووناکییـەدا سـەیری کـرد. نـهێنی لەوەدا بوو لـەپڕ دۆزییـەوە و لەبەرخۆیـەوە وتی: "بەسـەر چـاو بابـە ئێسـتا ئێـدی لـە هـەموو شـتێ تێگەیشـتم" باوکـە دوورو دوورتـر کەوتـەوە لـە نزیـك ئەوسـێ جێبـە خۆڵەمێشـیە کـە سـەقفەکانیان شەترەنجی ڕەش و سپی بوو، بوو بە پەڵەیەکی ڕەش، گوڵێکی سوور لەلای سەریدا و چەند گوڵی لۆکەی سپی لە ناو گوڵە سوورەکاندا، لەلای نەمامە چنارەکاندا کەوت.

سـیروان بەتـەنیا لـەلای پەنجەرەکـەدا وەسـتابوو سـی سـاڵ لەمـەوپێش تـازە ناوینووسـیبوو بـۆ قوتابخانـە. هـەروەك بـاوکی ئـارەزووی خوێنـدن و نووسـین لـە گیـانیدا دیـاربوو. هێشـتا قوتابخانـەکان نەکرابوونـەوە بـەڵام ئـەو هـەموو بەیانییـەك جانتـا تازەکـەی هەڵئـەگرت: زنجیرەکـانی دادەخسـتوو دەیکـردەوە. چـەند دەقیقەیەك دەیکردە کۆڵی و باوکی دەیدی و بە پێکەنینەوە دەیوت:

"پـیرۆزت بێـت کـوڕم. چ جانتایـەکی جوانـە! نـەمردم چوونـە قوتابخانەی تۆم دی."

دایکە بەخۆشحاڵییەکی زۆرەوە دەیپرسی:

"کوڕە نازدارەکەم بۆکوێ دەچی؟"

سـیروانیش بـە حاڵـەتێکی زۆر جدییـەوە وەڵامـی دەدایـەوە: "قوتابخانە!"

سیروان سەیری پۆپەی درەختەکان دەکات. ئێدی ئەو پەڵەو گوڵە سـوورو سـپیانە بەسـەر قیرتاوەکـەوە نـین. ئێـدی ئـەو جێبـە خۆڵـە مێشیانە دیارنین.

ژنێ لە ژێر چنارەکاندا بەسەر چیمەنەکانەوە کە تامەودایەکی دوور، تـا ئاسـۆ، بەرفراوانـە، گۆرانـی دەڵـێ و بێباکانـە پرچـە درێژەکـەی دەداتـە دەسـت بـا. کـەمێ لـەولاترەوە قەلـە ڕەشـەکان لـە دەوری یەك هەڵنیشتون.

دیدار

# گفتوگۆیەکی کورت لەگەڵ عەلی ئەشرەف دەروێشیان



–کاک عەلی ئەشرەف دەکرێ سەرەتا باسێکی ئەو فێستیڤاڵە ئەدەبیە بکەیت کە ساڵی پار لە دوورگەی کیش بەڕێوەچوو، چۆن بوو جەنابت داوەتکرایت بۆ ئەو فێستڤاڵەو نەڕۆشتیت؟

*ئەو فێستیڤاڵە لەلایەن ناوەندی گفتوگۆی شارستانیەتەکانی جیهانەوە بەڕێوەچوو. دیارە لە بارەی چیرۆك و ڕۆمان بوو. چەند چیرۆکنووس و ڕۆمانووسێکیان لە ئێران و دەرەوەی ئێرانەوە داوەتکردبو بەنامەو بە تەلەفۆنیش منیان داوەتکرد منیش قبوڵم نەکردو بە تەلەفۆن پێم وتن نایەم. هەروەها ناڕەزایەتی خۆیشم دەربڕی دژ بەو فێستیڤاڵەو بەو کەسانەش کە دەچن بۆ ئەو فێستیڤاڵە، بەڵام پاش دوو ڕۆژ ڕۆژنامەی (حەیات نو) لیستی ناوی ئەو نووسەرانەی چاپکردبوو کە دەچن بۆ فێستیڤاڵەکە وە ناوی منیشی تیابوو.

منیش زۆرم پێناخۆشبوو لەبەر ئەوەی من پێشتر دژایەتی ئەو نووسەرانەشم کرد کە دەچن بۆئەو فێستیڤاڵە. هەر لەبەر ئەوە نامەیەکم لەبری وەڵام بۆ ئەو ڕۆژنامەیە نووسی کە ئەمەش بەشێکە لە نامەکە.

بەڕێز سەرنووسەری ڕۆژنامەی (حەیات نو) لە ژمارە 531–7 ئیسفەندی 1380 هەواڵێك بەناونیشانی دوورگەی کیش میوانداری نووسەرانی سەرتاسەری جیهان دەکات، لەگەڵ هەواڵەکەدا لیستی ناوی نووسەرە داوەتکراوەکانتان چاپکردبوو ناوی منیش لە ناو لیستەکەدا بوو. جا تکادەکەم هەروەك چۆن لە یاسای ڕۆژنامەوانیدا هاتووە وەڵامەکەم لە هەمان لاپەڕەو لە هەمان ستووندا بەچاپبگەیەنن. من وەك عەلی ئەشرەف دەروێشیان نەك هەر لەگەڵ ئەم داوەتەدا نیم بەڵکو مەحکومیشی دەکەم. من بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ئەو جۆرە فێستیڤاڵانەدا نیم. هەروەها دانیشتن لەسەر سفرەیەك، لەکاتێکدا کە زۆربەی خەڵکی وڵاتەکەم بۆبەدەستهێنانی لوقمەنانێ لە بەیانیەوە تا شەو زەحمەت دەکێشن خیانەتە. گفتوگۆی شارستانیەتەکان لەوڵاتێکدا کە نووسەرە ئازادیخوازو شۆڕشگێڕەکانی شەهیدە دەکرێن و چارەنووسیان نادیارەی هەروەها قوتابی زانکۆکان بەناحەق مەحکوم دەکرێن بەزیندان، ڕۆژانە ڕۆژنامەنووسەکانی ڕەوانەی زیندان دەکرێن و مامۆستایانی پلە بەرز و قوتابیانی پێشتازی میدالی ئۆلۆمپیادەکان بەرەو دەرەوەی وڵات هەڵدێن. بەشداریکردن لە کۆبوونەوەیەکی ئاوادا هیچ جێی شانازی نییەو بگرە جێی شەرمەزاریشە کە نووسەران بەشداری بکەن.

ئەم کۆبوونەوەیەش دیوێکی ترە لە (جەژنی هونەری شیراز)ی (شا) لە لیستی داوەتکراوەکانیشدا ناوێکی ناسراو نابینین لەو نووسەرە بیانیانە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئەوانیش داوەتەکەیان قبوڵنەکردوە. بەڕای من گفتوگۆی شارستانیەتەکان سەرەتا دەبێ لەناو وڵاتێکدا بەڕێوە بچێ و دواتر لە سنوورەکان بچێتە دەرەوە. بە هەر حاڵ من لە کۆتایی ئەو نامەدا نووسیومە (من لەسەر ئەم خوانە خوێناویە دانانیشم) دیارە هیچ ڕۆژ نامەیەکی ئێران نەیوێرانامەکەم بە تەواوی چاپبکات جگە لە چەند دێڕێکی هەر بۆیە نامەکەم خستە سەر تۆڕی ئینتەرنێت و دامە زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی دەرەوەی وڵات، ئیتر ئەوە بو لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتیش هەرایەکی زۆری نایەوە. چەند کەسێ لە چیرۆکنووسان و ڕۆمانووسانی ئێرانی هەریەکەو دەلیلو و بیانویەکیان هێنایەوە، بۆ نموونە یەکێ دەیوت قوڕگم دێشێ وە یەکێ دەیوت لە سواری فڕۆکە دەترسم یەکێکی تر برام مردوە، ئیتر هەریەکە و بیانویەکیان هێنایەوە هەڵبەتە لە ڕێگای ڕۆژنامەکانیشەوە لە بەرامبەرم وەستان و وتیان ئەم داوەتە شتێکی چاکەو پێویستە و دەبێ هەموومان بڕۆین لە هەمانکاتیشدا وتیان دەروێشیان کارێکی باشی

نەکردوە بەناوی خۆیەوە ئەو فێستیڤاڵەی مەحکوم کردوە. منش دیسان وەڵامم دایەوەو وتم لە بەر ئەم هۆیانە لەگەڵ ئەو فێستیڤاڵەدا نیم وە هەروەها جارێکی تریش دووبارەی دەکەمەوە ئەم دەقە دەقی خۆمە و خۆم ئیمزام کردوەو پەیوەندی بە هیچ کەسێکەوە نییە. ئەو نووسەرانەی تر ئەو ڕایەی منیان پێناخۆشبوو. ئەوان دەیانوت هەرکەس حەزئەکات بچێت بابچێ منیش وتم هەر کەس حەزئەکات بچێ، بابچێ بەڵام من ناچم وەدەلیلیشم هەیە بۆ نەچونم. لەسەر ئەم نامەیە هەرچییەکم ڕووبەڕو ببێتەوە خۆم لێیبەرپرسم وە پاشانیش ئەمەم نوسی: چیرۆك و ڕۆمان نابێت ببێتە هۆی ڕاگەیاندنی حیزب و دەوڵەت و حورمەتی بشکێ دووەم لەبەر ئەوەی کە چیرۆك و ڕۆمان لەنێو جەماوەردا دنیایەکی هاوبەشی دروستکردوە و توانیوویەتی دەنگی نەتەوەکان بەیەکبگەیەنێ بۆیە لەم ساڵانەدا زۆرترین سانسۆر لەسەر چیرۆك و ڕۆمان بوە. پرسیار ئەوەیە چ زەرورەتێکی هەیە گفتوگۆی شارستانیەتەکان بەڕیچوە بچێ و چیرۆکنووس و ڕۆماننووسەکان داوەتبکەن. ئێوە خۆتان سانسۆر دەکەن کەچی ئەمڕۆ لەسەر ئاستی جیهاندا قسەی لەسەر دەکەن. ئەم جۆرە کۆڕوکۆبونەوانە دەبێ لەڕێگای ناوەند و ئەنجومەنە گەورەو ناسراوەکانەوە بەڕێوە بچێ. نابێ ئەو ناوەندو ئەنجومەنە هیچ جۆرە پەیوەندیەکیان بەحیزب و دەسەڵاتەوە هەبێت. بۆ نموونە دەبێ لە ڕێگای کانوونی نووسەرانەوە ئەنجام بدرێ. وە لەبەر ئەوەی ئێمە خۆمان لەناو خۆماندا و لەوڵاتی خۆماندا گفتوگۆی ئازادمان نییە و نووسەران و ڕۆژنامەنووسان ڕەوانەی زیندان دەکرێن، زۆر بێمانایە گفتوگۆ لەگەڵ شارستانیەتەکانی تردا ئێمە خۆمان ناوێرین لەگەڵ یەك بدوێین. لەلایەکی تریشەوە خودی ئەم ڕژێمە کە ساڵانە خەڵات دەداتە کتێبی ساڵ ئەدەبیاتی تیا دەکاتە دەرەوەو خەڵات نادات بە کتێبە ئەدەبیەکان.

لە دوای ئەو قسانە هیچکەس پشتگیری منی نەکرد. من تەنیام و بەڕاستی تەنیام.. تەنیا.



–ئەی ئەو نووسەرانە کێبوون کە پشتگیریان لێکردیتوو لەگەڵ ڕاکەی تۆدابوون؟

*چەند کەسێکی کەم بوون بە تەلەفۆن پەیوەندیان پێوەکردم لە بەرخاتری وەزعی ناوخۆیی وڵات ناتوانم لێرەدا ناویان بێنم چونکە بەتایبەتی قسەیان لەگەڵ کردم هیچیان چاپنەکرد. بەس بە تەلەفۆن سوپاسیان کردم.

–کاك عەلی تا چەند ڕات لەگەڵ ئەوەدایە کە نووسەر لە دەزگای حیزبی و دەوڵەتیدا کاربکات یان بە جۆرێك هاوکاری هەبێ لەگەڵی؟

*نا. نا. من بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ئەوەدانیم نووسەر حیزبی بێتو لەگەڵ دەسەڵاتدا کاربکات تەنانەت نابێ کەمترین هاوکاریشیان هەبێ چونکە زەرەر لە هونەرەکەی دەدات. هەرکاتێ قەڵەم بە دەستێ پەیوەندی دروستکرد لەگەڵ دەسەڵات ئیدی ئەو قەڵەم بە دەستە هیچ کاتێ سەر کەوتوو نابێت تەنانەت ئەگەر دەسەڵاتەکە دەسەڵاتێکی شۆڕش گێڕو جەماوەریش بێت. با ئەو دەسەڵاتە ئازادیخوازیش بێت من هەرگیز هاوکاری ناکەم. من بەس لەگەڵ جەماوەردام و خزمەتی جەماوەریش دەکەم و لە خزمەتی جەماوەردام.

–ئێستا چالاکیەکانی کانوونی نووسەران چین و جۆری کارکردنتان چۆنە؟

*کانوون ئێستا چالاکی هەیە و لە زۆربەی مەسەلەو ڕووداوەکانیش دا هەڵوێستی خۆی هەیە بۆ نموونە لە بارەی زیندانیکردنی نووسەرو وەرگێڕ دکتۆر ناسر زەر ئەفشان بەیاننامەمان دەرکرد. هەروەها بەیاننامەیەکمان وەك وەڵامێ بۆ دکتۆر موهاجەرانی دەکرد کەوتبووی کانوونی نووسەران شەرعیەتی نییە. هەروەها لە بارەی گەلی فەلەستینەوە. چالاکیمان زۆرە زیاتر لە 35 ساڵە ئەم کانوونە دامەزراوە بەڵام لەلایەن هیچکام لە ڕژێمەکانەوە مۆڵەتی کارکردنی بە ئازادی نەدراوەتێ.

–وەك جەنابت ئاماژەت پێکرد زیاتر لە 35 ساڵە ئەم کانوونە لەسەر دەستی کەسانێکی وەك ئەحمەد شاملۆ، ڕەزا بەراهەنی و هوشەنگ گوڵشیری، سیمین دانیشوەر، جەلال ئالی ئەحمەد وە پاقر پرهام. چەند نووسەرێکی تر دروستکراوە و تاوەکو ئەمڕۆ خەبات دەکات لە پێناوی ئازادی بیروڕا دەربڕینو نەبوونی سانسۆردا، لە هەمان کاتدا لە ماوەی ئەم 30 ساڵەدا لەلایەن هەردوو دەسەڵاتەکەوە واتە دەسەڵاتی شا و دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی سەرکوتکراوەو ئەندامانیان شەهید کردووەو پەلکێشیان کردونەتە زیندانەکان کە خۆت یەکێ بویت لەو نووسەرانەی لە وای ئەوەی چەندین ساڵ لە زینداندا بویت چەند ساڵێیش ڕێگایان لە چاپی بەرهەمەکانت گرتووەو نەیانهێشتوە چاپبێن. پێت وایە بۆچی هەمیشە دەسەڵاتەکان پێیان خۆش نییە لەم چەشنە کانونانە هەبێتو چالاکی خۆیان بکەن، ئایا بەڕای جەنابت بۆ ئەوەی کانونێکی ئاوا هەبێت و درێژە بە کارو چالاکی خۆی بدات چی بکات باشە؟

*هیچ کاتێ هیچ دەسەڵاتێ حەزناکات کانونێکی وا هەبێت و نووسەران و شاعیرانی تیا کۆبنەوە. چونکە هەمیشە ویستی نووسەر و هونەرمەند نەبوونی سانسۆرەو بەرقەراربوونی ئازادی بیروڕا دەربڕینە. بۆیە دەسەڵات هیچ کاتێ ئەمەی پێخۆش نییە. تەنانەت ئەم خاڵەش لە پرۆگرامی کانوونی نووسەرانیشدا هەیە ئێمە بڕوامان وایە کتێب ئەبێ چاپبکرێت پاشان ئەگەر کەسێ شکاتی هەبوو یان گلەیی و گازندەیەکی هەبوو نووسەرەکە دەتوانێت وەڵام بداتەوە. هیچ دەسەڵاتێ قبوڵی ناکات کۆمەڵێ ڕۆشنبیری ئازادیخواز بەرامبەریان بوەستێ و بەرگری بکات لە ئازادی بیروڕادەربڕین. لێرە لە بری وەزارەتی ڕۆشنبیری وەزارەتی سانسۆرمان هەیە تۆقیون لەوەی کۆمەڵگایەکی ڕۆشنبیر دروستببێت و لەبەرامبەر نا بەرامبەریەکانیاندا بوەستێ.

–جەنابت ناوت لەناو لیستی ئەو نووسەرانەدا بوو کە بەر شاڵاو و پەلاماری تیرۆریستان کەوتن و دواجار محەمەد موختاری و محەمەد جەعفەری پوینده شەهیدکران کە هەردووکیان دوو ئەندامی بەرپرسی کانوونی نووسەرانبوون. لەدوایی مەرگی هاوڕێکانتەوە لە دوای ئەوەی کە هەڕەشەی مەرگیشیان لە خۆت کرد چۆنە تاوەکو ئێستا بڕیارت نەداوە بچیتە دەرەوەی وڵات و ئێران بەجێ بهێڵی؟

*هەرگیز بڕیارێکی وام نەداوە و نایشی دەم وە هەمیشەش خەبات دەکەم لە پێناوی ئازادی بیروڕادەربڕین و دژی سانسۆر دەوەستم، درێژە دەدەم بە ڕێگای محەمەدی موختاری و محەمەد جەعفەری پوینده و سەعیدی سوڵتان پوور هەروەها ئامانجی منیش هەر ئامانجی ئەوانە و هەموومان خاوەنی یەك بیروباوەڕبووین و هەین.

–بارودۆخی ئێستای کانوونی نووسەرانی ئێران چۆنە؟

هەر وەك دەزانی کانوون هیچ جۆرە شەرعیەتێکی نییە لەلایەن دەسەڵاتەوە و هەروەها بۆیشی نییە هیچ جۆرە چالاکییەك بکات تەنانەت ئەم ساڵ نەیانهێشت هەڵبژاردنی ساڵانەی ناو خۆشمان بکەین. وە کۆبونەوەی هەفتانەو مانگانەشمان هەبو لەگەڵ ئەندامەکانمان کە ئەوانیشیان لێقەدەغەکردین دکتۆر ناسری زەرەفشان نووسەر و وەرگێڕ کە لە لێپرسراوانی کانوونی نووسەران ماوەیەکی زۆرە لە بەندیخانەیە و چارەنووسی نادیارەو چەندین ئەندامی تریشمان هەروا لە بەندیخانەن. ئێمە ئێستا کۆبونەوەی خۆمان لە ماڵی خۆماندا ئەنجام دەدەین و لەبەرامبەر ئەم زوڵم و زۆرەیشدا ئەوەستین.

–دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای دەیەی حەفتای هەتاو. ئەو ڕۆژانەی کە نووسەرانی ئێران لە بارودۆخێکی زۆرناخۆش و ناله باردابوون و هەمیەش ڕووبەڕووی گوشارو توندو تیژی ئەبوونەوە لەلایەن دەسەڵاتەوە، تاوەکو ساڵی (17) ی هەتاوی ئەوەبوو (134) نووسەر بەیاننامەیەکی ناڕەزاییان نووسی و بڵاویانکردەوە و لەسەرتاسەری دنیادا دەنگیدایەوە جەنابت یەکێك بوی لەو نووسەرانەی کە ئەو دەقەتان ئیمزاکرد کە دواتر بە دەقی (134) نووسەر ناوبانگی دەرکرد دەکرێ لەو بارەیەوە بدوێیت و مەسەلە دەقی 134 نووسەر چۆن و لەبەرچی هاتە ئاراوە؟

*دەقی 134 نووسەر لەسەردەمێکی زۆر ناخۆشدا بە چاپ و بڵاوکرایەوە کاتێ کە ئێمە هەستاین بەو کارە نووسەرانی ئێرانی لەناخۆشترین جەودا دەژیان و چارەنوسێکی نادیاریان هەبوو. ئەو کاتە کانوونی نووسەران چالاکی نەبوو هەر بۆیە ئەو دەقە بویە سەرەتای چالاکی و کارکردنمان لە دوایی شەهید کردنی سەعیدی سیرجانی لە زینداندا هەر بۆیە ئەوە بویە یەکەمین ناڕەزانیی دەربڕینی هاوبەشی ئێمە، بەڕاستی کاریگەرییەکی زۆرباشیشی هەبوو چونکە لە کاتێکی زۆرپێویستیشدابوو.

–دوا پرسیار ئەوەیە ڕات لەسەر ئەدەبیاتی کوردی چییە بەگشتی و بەتایبەت چیرۆك و ڕۆمان؟ ئایا بەڕای جەنابت ئەدەبیاتی کوردی ئەتوانێ جێگایەکی هەبی لەناو ئەدەبی جیهاندا؟

*بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئێستا ئەدەبیاتی کوردی نموونەی باشی هەیەو دەکری لە ڕیزی ئەدەبیاتی جیهاندا حسابی بۆ بکرێت، ئەگەر تەماشایەکی شعیری کوردی بکەین ئەبینین گۆران چ داهێنەرانە تازەگەرییەکی باشی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. هەروەها ئەبینین شاعیرانی پێش ئەو شاعیرانی دوایی ئەویش کاری زۆرچاکیان کردووەهەر لە فایەق بێکەسەوە تاوەکو ئەحمەد هەردی وکاکەی فەلاح و کامەران موکری محەمەد حسێن بەرزنجی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە بەرهەمی زۆرتازەو سەرکەوتوویان نووسیوە. یان "ئەی ڕەقیب"ە، کەی دڵدار. گەر باسی چیرۆکی هاوچەرخی کوردی بکەین لە خەومایی جەمال سائیب شتێکی زۆرچاك بوە بۆئەو سەردەمە واتە لە ساڵی (1925) دا بەرهەمێکی واهاتۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە و دەکرێ بەیەکەمین چیرۆکی کوردی دابنرێت هەر لەو سەردەمانەدا ئەحمەد موختار مەسەلەی ویژدان ئەنووسێ و حەسەنی قزڵجی کۆمەڵە چیرۆکێکی چاك بلاودەکاتەوە کە فەزای چیرۆکەکانی واقع گەرایییەو زیاتر لە ڕیالیسمدا کاری کردووەو زۆریش سەرکەوتووبووە.

لە ساڵی 1970 دا بۆماوەی چوار ساڵ کوردستان ئارامی ئەبینی بەخۆیەوەو هەر لەوماوە کەمەیە دا ڕۆشنبیرانی کورد چالاکی زۆر ئەکەن لە زەمینەی چاپ و بلاوکراووەدا هەر لە فۆلکلۆرەوە تاوەکو کاری وەرگێران و زۆربەی ژانرە ئەدەبییەکانی تر وە زۆر زوو هەست کرا بە پێویستی بونی کۆڕی زانیاری کورد و گەر هەڵەش نەکەم هەر لەساڵی 1971 دا بوو لە بەغدا نووسەرانی کورد کۆڕی زانیاری کوردیان دامەزراند. لەدوایی ساڵانی شەڕی دووەمی جیهانەوە مارف بەرزنجی و کاوس قەفتان چیرۆکە کورتەکانی خۆیانیان بە چاپ گەیاند و حەرەکەتێکی تازەیان بەرێ خست لە ئەدەبیاتی کوردیدا، لە بیرمان نەچێ ئیبراهیم ئەحمەد یەکێك بووە لەو پێشڕەوانەی ئەدەبیاتی کوردی ژانی گەلەکەی بۆ هەمیشە بەدرەوشاوەیی ئەمێنێتەوە لە ئەدەبیاتی کوردیدا و ئەم ڕۆمانەی ئیبراهیم ئەحمەد لەکاتی خۆیدا توانیویەتی کاریگەریەکی چاکی هەبێت خۆشبەختانە لە نەوەدەکاندا ڕۆمانی کوردی هێزو توانای خۆی بەچاکی نیشان دەدات و شاکارێکی وەك (حەسارو سەگەکانی باوکم)ی شێرزاد حەسەن دێتە کتێبخانەی کوردیەوەو ئەزموونێکی تازەی نووسین دەردەخات لەناو ئەدەبی کوردیدا، پاشان بەختیار عەلی بەدوو شاکاری چاك و دوو ئەزموونی زۆر سەرکەوتوو لەریالیزمی جادوی دادرێژە ئەدات بە بەرەو پێش چوونی ڕۆمانی کوردی بەلای منەوە بەڕاستی کارەکانی بەختیار عەلی شایستەی گەورەیی و ڕێز لێگرتنەو دەکرێ وەریش بگێڕدرێن بۆ سەر هەرزمانێکی زیندووی دنیا جارێکی تریش ئەیڵێمەوە ئێوارەی پەروانەو دواهەمین هەناری دنیا دوو شاکاری گەورەو دەگمەنن. خۆشبەختانە ئەبینین ئەمڕۆ سەدەها ڕۆژنامەو گۆڤار لە کوردستاندا چاپ ئەبن و زۆربەیشیان ئەدەبی و هونەرین یان لانی کەم لاپەڕەی تایبەت بە ئەدەبیاتیان هیەەو بەرهەمی زۆر سەرکەوتوویان تیا ئەبینم کە ئەکرێ لەم بەرهەمانە وەربگێڕدرێتە سەر زۆربەی زمانە زیندووەکانی دنیا هەر لەبەرهەمەکانی شێرکۆ بێکەس و ڕەفیق سابیر و لەتیف و عەبدوڵڵا پەشێوو فەرهاد شاکەلی و... تادەگاتە کەریم دەشتی و سەراج و دڵشاد عەبدوڵڵا و جەمال غەمبار و دلاوەر قەرەداخی و مهاباد قەرەداخی و کەژاڵ ئەحمەد.

دیسان شێرزاد حەسەن لەکورتە چیرۆکیشدا زۆر سەرکەوتوەو زۆربەی بەرهەمەکانیم پێخۆشە، ڕەووف بێگەردو ڕەووف حەسەن و حەمە فەریق حەسەنیش چیرۆکنووسی چاکن عەتا نەهایی و جەبار جەمال غەریب و عەتامحەمەد و ئاکۆ کەریم نموونەیەکی تازەی چیرۆکی کوردین و خاوەنی بەرهەمی نوێن.

هەر لەگەڵ ئەو نەوەیەدا ئازاد بەرزنجی و یوسف عیزەدین زۆرچاك کاردەکەن و بەرهەمەکانیانم زۆر پێخۆشە. جارێکی تریش دەڵێم ئەدەبی کوردی نموونەی زۆر چاکی تیایە کە ئەکرێ لەناو ئەدەبی ئەمڕۆی دنیادا خۆیان نیشان بدەن من وا دەزانم ئایندەیەکی ڕووناکمان هەیەو لە ئایندەیەکی نزیکیشدا نووسەرانی کورد بەرهەمی چاکتر و بەپێزتر ئەنووسن. دیارە لەم بەشەی کوردستانیش جگە لەو برادەرانەی بە کوردی ئەنووسن و کاری چاکیشیان کردوە، شاعیران و نووسەرانێکی زۆر هەن کە کوردن و بەزمانی فارسی نووسیویانەو ئەنووسن. ئەبولقاسمی لاهوتی یەکەمین شاعیری نوێخوازی ئێرانەو لە پێش نیمایشەوە شیعری نوێی وتوە خەڵکی کرماشانە و کوردە هەروەها کەسانێکی تر وەکو میرزادە عیشقی، شاهمراد مشتاق (شامی کرمانشاهی) دکتۆر ئیبراهیم یونسی، محەمەد قازی، عەلی محەمەد ئەفغانی، کەیوان سەمیعی، یەدوڵڵا بەهزاد، پرتو کرمانشاهی، مەنسوور یاقووتی، دکتۆر عەلی ئەکبەر تەقی پوور، محسین حەکیمی، دکتۆر ساڵح حسەینی.

-دواوت؟

*هیوادارم لاوانی کورد زیاتر بایەخ بدەن بە کتێب و خوێندنەوەو ڕۆژ بە ڕۆژ خوێنەر زیاتر بێت لە کوردستاندا سوپاس بۆ ئێوەش...

سازدانی: مەریوان هەڵە بجەیی

وتار

# قەیران لە ئەدەبیاتی مناڵان و تازە لاوانی ئێران...!

عەلی ئەشرەف دەروێشیان

ئەوەی کە ئەدەبیاتی منداڵان و تازە لاوان لە ئێران گیرۆدەی قەیرانێکی هەمە لایەنەیە، هۆکەی نەبوونی قەیران لەسەرجەم مەسائیلە کۆمەڵایەتیەکاندا نییە. کۆمەڵگای ئەمڕۆی ئێران لە هەموو لایەکەوە لەگەڵ قەیرانی جۆراوجۆر دەستوپەنجەنەرم دەکات. هەر بەم پێیە قسە کردن لەسەر قەیرانی نێو ئەدەبیاتی منداڵان و تازە لاوان بە مانای جیاکردنەوەی ئەم باسە لەسەرجەم باسەکانی تری کۆمەڵایەتی نییە.

بە بڕوای من ڕیشەی هەموو ئەم قەیرانانە لە هەر بوارێکدا، لە نەبوونی فەزایەکی گونجاو بۆ بیرکردنەوەو دەربڕینی ڕاوبۆچوونەکان و بەشێوەیەکی گشتی تەفتیشی عەقائیدە. ئەگەر لە هەر گۆشەیەك لەم جیهانە پان و بەرینەدا تۆزقاڵێك بواری بیرکردنەوە، ئازادی ڕادەربڕین، بدرێ ئەوا دەکرێت بە باشی گیروگرفتی زۆر مەسائیلی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی چارەسەربکرێت.

لە پەروەردەو فێرکردنی ئێمەدا ڕۆڵێك بۆ جێخستن و دەربڕینی بۆچوونی ئازاد و تەنانەت بیرکردنەوەو هەڵبژاردن لە ئارادا نییە. هەر لە سەرەتاوە تەواوی شتەکانی ناو کتێبەکان بۆ لەبەرکردن و دووبارە کردنەوەو دانەوەیان بە مەبەستی نمرە وەرگرتنە. هەر لە سەرەتای منداڵییەوەو لە زۆرێك لە بنەماڵەکاندا خەتێکی سوور لە بەرامبەر ڕای ئازادانەو دەربڕینی بۆچوونەکاندا کێشراوە. هەر بەم شێوەیەیە کە ترس و دڵەڕاوکێ لەنێو دڵی منداڵاندا دروست دەبێ کە بەر بە دروستبوونی کەسایەتییان دەگرێت.

بێگومان سەرچاوەی سەرجەم دووڕووییەکان، دزی و فزی و درۆکردنەکان لە دۆخێکی وەهادایە. ئەوە کردەوەی نامەسئولانەی سەرجەم داڕێژەران و پەرە پێدەرانی ئەو داب و ونەریتە کۆنەیە کە زۆر بێبەزەییانە بەر بە گەشەی فکری منداڵان و تازە لاوان دەگرن و ناهێڵن بۆ ساتێکیش جیا لەوەی کە خۆیان دەیانەوێت بیر بکەنەوە.

هیچ گومان لەوەدا نییە کە ڕاستییەکان لە چەشنی، ترس لە ئیمتیحانی وزاری و هەوڵدان بۆ چوونە زانکۆکان ئەویش ڕەت بوون لەو پرۆسە سەختە و سەرکەوتن لە بەدەستهێنانی ئەو ڕەقابەتە قوڵەی کە لە نێوان ملیۆن و ونیوێك کەس لە ئارادایە، قورسایی خستۆتە سەر ژیان و گوزەرانی سەرجەم ئەو منداڵ و تازەلاوانەی کە بەرەو ئاسۆی ڕوونی دواڕۆژ هەنگاو دەنێن.

سەرنج بدەن

دەبێت هەر وشەیەك یا دێڕێك لە کتێبەکانی قوتابخانە، بە دەیان جار و بگرە بە سەدان جاریش لەبەر بکرێت دەبێ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کاربکەیت و بخولێیتەوە تا بەڵکو شانس یاوەرت بێت و سەرکەوتن بە دەست بێنی. دەبێ هەر بخوێنی و سەرجەم ئەو شتانەش کە هی قوتابخانە نین و بە زۆر و زۆرداری وەك دەندرین و بێئەوەی کە بتوانی وەدەستی بێنی لێت دوردەخرێتەوە. بەم شێوەیە عادەت کردن بە خوێندنەوەو فێربوونی زانست و تەکنۆلۆژی تایبەت بە کتێبەکانی دەرەوەی قوتابخانە شتێکی ناومکین دەبێت. ئەوەی کە پێویستە هەر منداڵێك بە دەر لە کتێبەکانی قوتابخانە، کتێبی تر بخوێنێتەوە تا بە باشی ئاگاداری دەوروبەری بێت و ئاگاداری ئاڵوگۆڕەکانی ناو کۆمەڵ بێ و ڕۆژ بە ڕۆژ بازنەی فیکری زیاتر ئاوەڵاتر کاتەوەو زانیاری زیاتر بەدەستبێنێ، بواری تایبەتی بۆ تەرخان ناکرێ و ناهێڵدرێ لەم ئاستەدا هەوڵەکان بخرێنە گەڕ.

وەرگێڕانی کتێبەکانی دەرەوەی قوتابخانە یان تەنانەت خوێندنەوەیان و بەکردەوە دەرهێنانیان لە بواری پەروەردەو فێرکردنی منداڵاندا شتێکی پێویستە. دەبێ هەر لە سەرەتاوە منداڵ مێشکی بە سەرجەم ئەو شتانەی کە لە دەوروبەری دەگوزەرێ ڕابێت، دەرکیان بکا و بەکاریان بێنێ. ئەمڕۆ ئەنگیزەکان و داهێنانەکان ئەوەندە بەرتەسککراونەتەوە کە هیچ تامەزرۆییەکی بۆ فێربوون و نواندنی ڕۆڵێکی گرنگ لە ئاست داهێنانەکاندا نییە. یان تەنانەت ئەو کەسانەش کە پەنا بۆ نووسین دەبەن و بەتایبەتی مەسائیلێك کە پەیوەندیی بە منداڵانەوە هەیە دەدەنە بەر لێکۆڵینەوە، تائێستا هیچ شتێکی تازەیان دانەهێناوە. هێرش بردن بۆ تەرجەمەی بەرهەمی دەرەکی لە پەیوەند بە ئەدەبیاتی منداڵان و تازەلاوان بەڕادەیەك پەرەی سەندووە کە باوەڕناکرێت. بەڵام شتێك کە جێگای سەرنج و لێدوانە ئەوەیە کە کەمترینی ئەو نوسراوانە باس لە گیروگرفتەکان، داهێنانەکان، ئارەزووەکان، چۆنێتی بارهێنانەکان دەکات. هەروەك چۆن لە سەرەوە باسمانکرد، وەرگێڕدراوی

سـەرجەم نوسـراوەو نامیلکـە دەرەکییـەکان بـە ئەوپـەڕی لوتکـەی خـۆی گـەیوە. ئەگـەر بێـت و بەشـێوەیەکی گشـتی هەڵسەنگاندنێکمان هـەبێ لـەم بارەیـەوە دەتوانین بڵێین کە هەشتاوپێنج لە سەدی سـەرجەمی ئـەم وەرگێڕانانـە تایبـەت بـە منداڵان و ئـەدەبیاتی منـداڵان بـووە. ئەگـەر بەشـێوەیەکی گشـتی باسـی ئـەو خێزانانـە بکـەین کـە دەیانـەوێت بەشـێوەیەك منداڵـەکانیان ڕابێنـن لـە خوێندنـەوەی ئـەم بەرهەمانـە دەبـێ بڵێـین کـە زۆربـەی هـەرە زۆریـان پـەنا بـۆ بەرهـەم و نووسـینی نووسـەرگەلێکی بـەناوبانگی وەك جیسـکی ڕۆڵینـگ، ڕۆڵـدداڵ، شـل،.. چـەند نووسـەرێکی تـر دەبـەن. ئـەم نووسـەرانە لـەنێو منداڵان و تازەلاوانی ئێراندا لە خۆشەویستییەکی تایبەتی بەرخوردار دەن.




وێنەکێشان و کێشانی ڕوخسارەکان لەنێو کتێبی منداڵاندا شتێك نییە کە هەروا بەسانایی بخرێتە پەراوێزەوە. بـەڵکو ئـەم بەشـە لـە ڕیـزی سـەرجەم ئـەو بەشـانەدایە کـە دەبێـت سـەرنجی بدرێتـێ. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە ئەم بەشەش شاڵاوی سانسۆر گرتۆتیـەوەو لـە چنـگ خۆیـدا قەتیسـی کـردووە. بـۆ ئـەم مەبەسـتە سەرنج بدەنە ئەم چەند نموونەیە:

مریشکێك کە جووجکەکانی لە دەوری خـۆی کۆکردۆتـەوە، بـە تاوانی لەبەرکردنی کراسێکی ئاودامانی کورت، لادەبرێ و لە چاوان دوردەخرێتەوە، بۆقەکە نابێ بە بێ جلوبەرگ بچێتە ناو ئاوەکەوە و بخولێتەوە. لە نووسینێکی وەهادا ناکرێ و ناشبێ وشەی ڕووت بە کاربـبردرێت. یـانی بـەکارهێنانی ڕسـتەیەکی وەك.. بۆقەکـە بـە ڕوتوقوتی چووە ناو ئاوەکە، تاوانە. تەنانـەت ئەگەر بڵێی ژوورەکە خاڵی و تاریك و تنۆکە، ئەوا تاوانت کردووەو سانسۆردەکرێیت.

گەورەترین لەتمەیەك کە لە ئیعتیباری کتێبەکەو بە تایبەتی نووسەرەکەی دراوە، لەلایـەن کەسانێکەوە دەدرێت کە لەژێر چاودێری و پشتیوانی دەوڵـەتدان. ئەوان لە ڕاستیدا دەستەمۆن و بەجۆرێك ڕادێن کە هیچ شتێکی تازەو ئـەوتۆیان بـۆ جـەماوەر پێنـەبێ و لـەم پەیوەندییەشدا هیچ هەوڵێك لە خۆیان نیشان نادەن چونکە ئەوان بە باشی دەزانن کە نووسینەکانیان بـەبێ دەستکاری لەلایـەن ئۆرگانە پەیوەندی دارەکان بە دەوڵەتەوە دەکرێ و لە چاپ دەدرێت، بەم شێوەیە بەبێ نواندنی ڕۆڵێکی گرنگ لە ئاست توێژێکی تایبەتی کۆمەڵگاوە وەگەڕ نەخستنی داهێنانەکان، ژیانیان تـەئمین دەبێت. قەرز وەردەگرن و هاندەدرێن بەبێ ئەوەی هیـچ هـەوڵێك بـۆ بەرهـەم هێنانی کتێبی باش و پڕبایـەخ بدەن. بەڵکو هـەوڵی ئەوان تـەنیا تایبەتە بە ڕاگرتنی ئەو سیستەمەی کەکۆمەك دەکا بە ڕاگرتنی داب و نەریت کۆنەکان و بارهێنانی گرنگترین توێژی ناو کۆمەڵ بەشێوەی کۆن. پێویستە ئەوەش بوترێت کە ئەو کەسانەی کە لـەم ئاستەدا خەریکی هەوڵدانن، سەرجەمی نووسراوەکانیان هی کەسانی ترە، بەڵام ئەوان بەناهەق دەیکەنە هی خۆیان و پاشانیش کۆمەڵێك وێنە و ڕوخساری جیاجیا کە هەرکامیان پارێزگاری لەو سیستەمە دەکات کە لەلایـەن خاوەنەکانیانـەوە بۆیان ماوەتـەوە دەکێشنەوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە فێرکردنی منداڵانەوە نییە.

بەم شێوەیە بیرەکـان، داهێنانـەکان سـەرکوتدەکرێن و وەلا دەنرێـن و جێگـای خۆیـان دەدەن بـە کۆمـەڵێك شـتی پـوچ و بـێ ناوەڕۆکی تر.

زیاتر لـە بیسـت و چـەند ساڵێك تێکۆشـان تـا منـداڵان هـەر بـە شـێوەی پێشـوو یـانی بەوشـێوەیەی کـە تـا ئێسـتا هـاتووە، باربێنن. لـەم پێوەندەدا، توندوتیژییان بەکارهێنا. پرۆژەی جۆراوجۆریان خستە گەڕ پارەوپولێکی یەکجار زۆریان خـەرج کرد. کتێبـەکانی سەراسـەری وڵاتیـان لـە کتێبـەکانی غـەیری خۆیـان جیـاکردەوەو سـوتاندیان و توڕیـان هـەڵدان. لـەپای ئەوەشـدا کتێبەکانی خۆیان هێنایە مەیدان و بەهەزارانیان لێچاپ کردن. بەڵام سەرباری هەموو هەوڵەکانیان ئاکامەکەی شتێکی تری لێ وەشایەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ منداڵان لە بۆچوونی داسەپاو بە سەریاندا و لە خوێندنەوە دوور کەوتنەوە چونکە ئەوەی دەیانویست و بۆیان بە کەڵك بوو و لە هەمان حاڵیشدا حەزیان لێیی بوو و پێداویستیە دەروونی و عاتیفیەکانی ئەوانی دابین دەکرد، لە بەردەستیاندا نەبوو، یان بە واتایەکی تر لێیان زەوت کرابوو. هـەر بـەم پێیـە توێژێك سـەری هـەڵدا بـێ ئەنگیزە، بێ عاتیفە

هەست بە بەرپرسیاری نەکردن، دڵسۆزانەبوون لە بەرامبەر یەکتری. توێژێك بەبێ هاوبەش بوون لە فکر و دەردەکان، توێژێك بێ ئیحساس و سەرگەردان و بێ پشت و پەنا، ئەم توێژە ئیتر نە سەرنج دەداتە خۆی و نە دەوروبەری.

ئەگەر بڕیاربێت کە عادەت بەکتێب خوێندنەوە لەناوبرێت، ئەم عادەت و لە بەین بردنە دەیان وسەدان پرسیار دروست دەکات و هەرکامیان وروژاندنی هەستێکە هەستێکی پاك و بێگەرد، بەڵام دیسان بەڵام و هەیهات...!!!

ڕۆژهات و چوو تکاو ڕجا یەك بەدوای یەکدا بوون بە ملۆزم، بوون بە هەوێن، بەڵام، بەڵام، بەرپرسان نەیان کرد و ونەشیانویست بیکەن. چونکە بۆیان گرنگ نەبوو، ناشبێ بۆیان گرنگبێت چونکە ئەوان...!!!

ئەمڕۆکە سیمایەکی تایبەت و ناسراومان لە ئەدەبیاتی منداڵان و تازەلاواندا نییە. لە حاڵێکدا کە بەر لە ساڵی 1357، سیمای ناسراوی وەك سەمەدی بیهرەنگیمان لە پەیوەند بە ئەدەبیاتی منداڵان و تازە لاوان یەکجار زۆربوو.

سانسۆر یەکێکی تر لەو کێشە سەرەکییانە بوو کە وەکو ملۆزمێك هاتە دنیای ئەدەبیاتەوەو لەتمەیەکی تری لە ئەدەبیاتی منداڵان و تازە لاوان دا. توندوتیژی نیشاندان لەم بوارەدا، لەلایەن پەرەپێدەرانی، تایبەتمەندی خۆی هەبوو، توندوتیژییەکانی ئەم بوارە لەچاو سەرجەم بوارەکانی تر یەکجار زۆر و بەرچاوە. چونکە هەر کتێبێك دەبێ لەژێر دەستی سێ دەستەی لێکۆڵەرەوە تێپەڕبێت تا مەجالی چاپ کردنی پێبدرێت. ئەم توندوتیژیانە زەربەیەکی تری لە ئەدەبیاتی منداڵان دا. لەلایەکی تریشەوە ڕۆڵی ڕاگەیاندنە گشتییەکان کە لە ژێر چاودێری دەوڵەتدان ناتوانرێت لەبەرچاونەگیرێت.

فیلمە جیناییەکان کە پڕاوپڕن لە توندوتیژی و کوشت و کوشتار و خوێن ڕشتن کە شەو وڕۆژ لە تەلەفزیۆنەکانەوە بڵاودەکرێنەوە، سەرنجی منداڵان بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت. بەناچاری، ئینتەرنێت و سەحنە سەتەلایتیەکان و ڤیدیۆ سیدیەکان تاکە پشت و پەنایەکن کە منداڵان و تازە لاوان پەنای بۆ دەبەن منداڵانێك کە هەموو دەرگاکان لە بەرامبەر خۆیاندا بەداخراوی دەبینن و بەرهەمێکی ئەوتۆیان بۆ خوێندنەوە نییە، بەشی هەرە زۆری کاتی خۆیان لەگەڵ بەرنامەکانی ئەم ڕاگەیاندنانەدا دەبەنە سەر و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لەوەی کە خۆیان هەیانەو بە تایبەتی فەرهەنگ و داب و نەریتی نەتەوەییان بێگانە و دوورە پەرێز دەبن.

بە تێڕوانینێکی گشتی بەسەر بارودۆخی ئێستای قەیرانی نێو ئەدەبیاتی منداڵان و تازە لاوانی ئێران بەو ئاکامە دەگەین کە هونەرو ئەدەبیات باسێکی فەرمایشی نییە. نابێ بەشێوەی بیرۆکراتی بەرو پێش ببردرێ و نوسەرانی بۆ بار بهێندرێ. نابێ بۆیان دیاری بکرێ کە چ بنوسن یان چۆن بنوسن و چ نەنوسن. زاڵ بوونی هەر یاسایەکی لە چەشنی توندوتیژی و وسانسۆر و دیاریکردنی شێوەی نووسین و چۆن نووسین، لەتمە لە هونەر و ئەدەبیات دەدات و ئەم هونەرە بەرێگایەکی دوور لە بەرژەوەندی جەماوەردا ڕێبەری دەکات. واتە ئەگەر بە زمانێکی سادەتر باسەکەمان شی بکەینەوە دەتوانین بڵێین:

منداڵانمان نابێ و نایانەوێ شتی لاوەکی فێربن، دەیانەوێ و گوێبیستی هونەری پێشڕەو بن کە بتوانێ کەسایەتیان بناسێنێ و لە ئاڵوگۆڕەکان و داهێنانەکاندا بەشداریان پێبکات، منداڵان دەبێ جیهان بناسن و گەشەی پێبدەن.

هری پاتر بەبێ هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەك لە بیرو بۆچوونەکانی دنیا فەتح دەکات و داهاتێك بەرابەر لەگەڵ هەزاران چاڵەنوت بۆ وڵاتەکەی بە دیاری دێنێت، عەلیە چکۆڵەکەی ئێمەش کە خاوەنی هەزاران چاڵە نەوتە لە گۆشەی ئاواییەکی دوورکەوتوو لە ترسان قسەکانی نیوەناتەواو دەمێنێتەوەو لە تەنیایی و نەناسراوی و هەژاریدا چرای بێنەوتی ژیانی بۆ هەمیشە دەکوژێتەوە. ئاخر...!

## سەرچاوە

نەشرەی داروگ

و. عەزیز ئاڵەکی

دیداری ڕۆژنامەی کوردستان لەگەڵ

# عەلی ئەشرەف دەروێشیان



## سەر لێشێواوی نووسەران و نەبوونی بڕوا بە خۆبوون لە زۆربەیاندا کێشەی گەورەی ئەورۆی ئەدەبیاتی ئێرانە

هەمووومان عەلی ئەشرەفی دەروێشیان دەناسین. نووسەری کوردی خەڵکی کرماشان و فارسی نووس. دەروێشیان چەندین دەیەیە بۆ خەڵك دەنووسێ و بۆ خەڵك دەژی. ناوبراو لە ڕیزی ئەو دەگمەن نووسەرانەیە کە سەربەخۆیی خۆی پاراستووەو سانۆسۆرو زیندان و ڕاوەدوونان نەیتوانیوە ناوبراو لە خزمەت بە ئەدەبیاتێکی پێشڕەوو گەلی دوورخاتەوە. لەسەر عەلی ئەشرەفی دەروێشیان زۆر نووسراوەو بۆ خۆشی قسەی نەگوتراوەی زۆر پێیە کە لەم چاوپێکەوتنەدا لەگەڵ ژیان و بەرهەمەکانی ناوبراو لە زمانی خۆیەوە ئاشنا دەبن:

**ئاغای دەروێشیان چیرۆکەکانی "ابشوران" و "از این ولایت" ساڵانێکی زۆر سەرنجی خوێنەری بەلای خۆیان ڕاکێشابوو. منداڵ و گەورە لەگەڵ کەسایەتییەکانی ئەم چیرۆکانە گریان و پێکەنین. دەکرێ لەو کەسایەتییانە بدوێن؟**

ئەو چیرۆکانە چەند بەشێکی ژیانی بنەماڵەییم بوون لە کرماشان! چارەنووسی ئەو خانووە ڕووخاوو هەژارانەیە کە خەڵکی هەژارو ڕەش و ڕووت لە قەراخ ئاوەڕۆکان دروستیان کردبوون. ئەکبەر و ئەسغەر (دوو کەسایەتی چیرۆك)و خۆم سەمبوڵی منداڵانی ئەو سەردەمەین. دەتوانین ئەو بنەماڵەیە وەك بنەماڵەیەکی ئەو سەردەمە چاو لێ بکەین. من لەو بڕوایەدام کە هەژاری سەرچاوەی هەموو ناعەدالەتییەکە. ئێمە بە قەزاو قەدەر لە دایك بووین و هەر کاتیش ئێمکانی ئەوە هەیە بە لاریدا بکێشرێن. باوکم کرێکارێکی بە ئیمان و زەحمەتکێش بوو. هیچ کەس لەو بڕوایەدا نەبوو کەباوکم بەهۆی نەداری و هەژاری بکێشرێتە نێو کاری قاچاخی مەوادی موخەدیرەوە. چونکە ئینسانێکی سادە بوو. سەرەنجام بەهۆی کاری قاچاخەوە گیراو کەوتە زیندان. ئەو کەسەی کە باوکمی کێشابۆوە کاری تریاك فرۆشتن، پاش زیندانیکردنی باوکم نە تەنیا هاوکاریی ئیمەی نەکرد بەڵکو قەرزاربارییشی کردین. بۆیە بۆ قەرەبووکردنەوەی قەرزەکان و بژێوی ژیان لە تەمەنی 11 ساڵیدا کێشرامە کاری قاچاخ و بە ناچاری ڕێگای باوکم درێژ پێدا. ئەمن مەجبوور بووم ژیانی بنەماڵەیەکی هەشت کەسی دابین بکەم. هەر بۆیە باری تریاکی ئەو کابرایەم دەبردە تاران و لەوێشەوە بەرەو ڕەشت. ئەوە ئەو قازاو قەدەرە بوو کە باسم کرد.

... ئەو کاتەی کاری قاچاخم دەکرد هەمیشە دەترسام. خەوو خۆراکم نەبوو هەر ئەو کاتە لە هەموو جۆرە ماددە بێهۆشکەرێك بێزار بووم. تەنانەت چا خواردنم وەلانا. دوای ئەوەش کە بە هۆی تێکۆشانی سیاسی و نووسینی کۆمەڵە چیرۆکی "ابشوران" و "از این ولایت" کەوتمە زیندان و لە زیندانی کرماشاندا خرامە پاڵ زیندانییەکانی دیکە بێزاریم لە مەوادی موخەددیر زیاتر پەرەی سەند. لە نیزیکەوە گەندەڵی و خۆفرۆشی و خەیانەتم لە گیرۆدەبوان دی و زیاتر ڕقم لێی دەبۆوە. بەڵام نە لەو ئینسانە هەژارانەی کە تووشی ئەم بەڵایە ببوون بەڵکو لەو کەسانە کە بەرژەوەندییەکانیان لە موعتادکردنی لاواندا دەدی و هەوڵیان دەدا لاوان موعتاد بکەن بۆوەی کە هەرچەشنە ناڕازی بوونێك لەوان بگرنەوە. گیرۆدەبوان بۆ دابینکردنی مەوادهەمووکارێکیان دەکرد، تەنانەت جاسووسی ودزی. ئەوان کەوشەکانی منیان لە زیندان دزی. تەنانەت جلوبەرگەکەمیان برد و فرۆشتیان. منیش بێ کەوش وجلوبەرگ و پێخەف لە گۆشەیەکدا دادەنیشتم و بە حاڵیان دەگریام. بنەماڵەی هەشت کەسی ئێمە لە دیوێکی چووکەی شاری کرماشان ژیانیان بەسەر دەبرد. لەماڵی ئێمەدا هەمیشە شەڕو هەڵلا بوو؛ شەڕ لە سەر پارووپەك نان. هەربۆیە ئەکبەرو ئەسغەر نەیانتوانی درێژە بە خوێندن بدەن و لە 11 ساڵیدا قوتابخانەیان جێهێشت و چوونە بازاڕی کار. هەر چەند هەمووومان لە منداڵییەوە دەستمان دایە کارکردن و بەتایبەت

که هاوینان قوتابخانەکان دادەخران خەریکی کارکردن دەبووین. هەموو کارێکمان دەکرد. ئەوان بوونە قوربانی، قوربانی هەژاریماڵەوە. ئەوان دەستیان دایە کارکردن تا لانیکەم من درێژە بە خوێندن بدەم هەرچەند باوکم دژی خوێندنی من بوو. لەو بڕوایەدا بوو کە دەبێ کار بکەین. ماوەیەك بووم بە شاگردی بەننا بەڵام دەستم لە خوێندن هەڵ نەگرت. لە خوێندندا دایکم پشتیوانم بوو. لەبەرانبەر باوکم ڕادەوەستاو لێی دەپاڕایەوە کە ئیزن بدا بخوێنم. ئێستاش گریان و پاڕانەوەکانی دایکم لە بیر ماوە... هەر لە منداڵییەوە هەستم بە زوڵم و هەژاری کرد. ناعەدالەتی لەماڵ، کۆڵان، شەقام و کۆمەڵگا. هەر بۆیە دژی هەڵسوکەوتی باوکم ڕاپەڕیم. کاتێکیش بووم بە مامۆستاو هەژاری و ڕۆژڕەشی کۆمەڵگام بینی دژی ڕێژیمی شا ڕاپەڕیم و ئێستاش ئەو هەستی بە گژدا چوون و ڕاپەڕینەم بە دژی هەموو دیکتاتۆرەکانی جیهان هەیە.

بارودۆخی ئەدەبیاتی ئەوڕۆی ئێران چۆن دەبینن؟




کێشەی گەورەی ئەدەبیاتی ئێمە سەرلێشێواوی نووسەران و شاعیران و نەبوونی بڕوا بەخۆبوون لە زۆربەیان دایە. تا کاتێك خۆمان نەدۆزینەوە گێرۆدەی ئەم سەرلێشێواوی و بێ باوەڕییە دەبین. ئێمە وەك ئەو قوتابییەمان لێهاتووە کە وانەکەی نەخوێندوەو لەکاتی ئیمتیحاندا چاو لە دەستی قوتابیەکەی دیکە دەکا. بەرهەمی نووسەرانی خاریجی بۆ ئێمە وای لێهاتوە. کاتێ کە دەبیسترێ بورخس لای لە "هزارو یك شب-هزارو یك شەوە" کردۆتەوە لە ناکاو دەست دەدەینە خوێندنەوەی "هزار و یك شب". فتیز جراڵد دەبێ دەست بداتە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی خەیام تا ئێمە لا لە خەیام بکەینەوە. بائولو کوئیلوش ئێمە دەخاتە بیری خوێندنەوەی مەولەوی. لەم دوایانەشدا وەرگێڕانی شیعرەکانی مەولەوی بەهۆی بوونی ریتم و ئاوازییەوە لە ئەمریکا دەستی پێکردوە. تازە بەهۆی سانسۆرو بەرگری کردن لە چاپ و بڵاوبوونەوەی کتێب تامەزرۆییەکی زیاتر بۆ خوێندنەوەی ئەو بەرهەمانە دەبینرێ. بە هەرحاڵ کاتێك دەتوانین ئەدەبیاتێکی ڕەسەن و خەلقی بخوڵقێنین کە ئەو کۆسپە ئاماژە پێکراوانە لابچن و سیستەمی ڕاهێنان و بارهێنانی ئێمە گۆڕانی بەسەردا بێ. بەشێوەیەك کە منداڵ لە یەکەم ڕۆژی چوونە قوتابخانەیەوە هیچ ترس و دڵەڕاوکێییەکی لە دەربڕینی ڕوانینەکانی نەبێ. بەگشتی سانسۆر دەبێ لابچێ تا ئینسان جموجوڵی هەبێ و کەس بەهۆی ڕادەربڕین و بیروباوەڕەوە نەخنکێندرێ.

ئایا کانوونی نووسەرانی ئێران لە حاڵی نەهادینە بوون دایە؟

ئەگەر کانوونی نووسەرانی ئێران دەیەوێ نەهادینە بێ ئەمە بە واتای نەهادینە بوونی دەوڵەتی نیە. ئێمە بۆ نەهادینە بوونی ئامادە نین ئیمتیاز بدەین. ئێمە تەنیا پێڕەوی لە بنەماکانی مەنشووری جیهانیی مافی مرۆڤ دەکەین. لەم بوارەدا وەك هەموو گەلانی پێشکەوتووی جیهان هەڵسوکەوت دەکەین. واتە بۆ "ثبت"ی کانوون ڕوو لە جێگایەك دەکەین کە دانپێنانێکی بەرانبەری لێ بکەوێتەوە. ئێمە دەمانەوێ جێگایەکمان بۆ کارکردن هەبێ و کلاسەکانمان دەست پێبکەینەوە. ئەو کەسانەی کە هەراو هوریایان وەڕێ خستوە کە گوایە نەهادینە بوونی کانوون بە واتای دەوڵەتی کردنی کانوونە، بە تەواوی لە هەڵەدان. ئەوانە ڕاست ناکەن و دەیانوێ خۆیان دەربخەن و بەجێگایەك بگەن. ئینسانێکی ڕاستگۆ و سالم هیچ کاتێك کەسانێك کە کارێکیان نەکردووە، تاوانبار ناکا. کانوونی نووسەران وەك هەمیەش سەربەخۆیەو لە سەردەمی جەلال ئال ئەحمەد- کە یەکێك لە دامەزرێنەرانی کانوونە- لە ڕوانگەی ئەندامەکانیەوە مەشرووعیەتی هەبووە. چونکە خەباتی کردوە. زیندانی کێشاوەو قوربانیداوە. هەروەها خۆڕاگرانە لە تێکۆشان دژی سانسۆر و پاراستنی ئازادی ڕادەربڕین لە هەموو بوارەکاندا دەچێتە پێش...

لەو ماوەیەدا کۆمەڵێك کتێب لە کتێب فرۆشییەکاندا کۆکراونەتەوەو دەستیان بەسەردا گیراوە. ڕای ئێوە لەم باریەوە چییە؟

ئەم کارە بارودۆخی کتێب خراپتر دەکا. هەروەها مەترسییەکە بۆسەر ئەمنییەتی کاری ناوەندەکانی چاپ و بڵاوکردنەوەو ئیدی هیچ بڵاوکەرەوەیەك ئامادە نابێ سەرمایەی خۆی بخاتە مەترسییەوە. چونکە ئەو کتێبانەش کە کۆکراونەتەوە لەلایەن ئێرشادەوە ئیزنی بڵاوکردنەوەیان پێدرابوو. ئەوە کە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا ئەو کەسانەی کە لە نووسین و بڵاوکردنەوەی کتێبدا دەستیان هەبووە ڕاپێچی دادگا بکرێن و کتێبەکانیان کۆبکرێنەوە بۆ میللەتێك کارەساتە. قەدەغەکرانی کتێب شێوەیەکی دیکەی سووتاندنی کتێبە.


لەگەڵ هۆشەنگی گوڵشیریدا

-ئێستا چ کتێبگەلێکتان لە ژێر چاپدایە؟

یەکێکیان کۆمەڵە وتارێکە لە ژێر ناوی "چون و چرا" کە 6 مانگە لە وەزارەتی ئیرشاد ڕاگیراوە. دەڵێن دەبێ هێندێك لە وتارەکانی لابردرێن و منیش قبووڵی ناکەم. ئەمن بەداهاتوو هیوادارم و خەڵکی نایانەوێ لاوەکانیان بەهۆی نەخوێندنەوە بکێشرێنە جۆرەها گەندەڵی و ماڵوێرانی، "فرهنگ افسانەهای مردم ایران" کتێبێکی دیکەیە کە بەرگی دووهەمی چۆتە ژێر چاپ و هەروەها بەشی دووهەمی بەرگی یەکەمی "داستانهای محبوب من" کە بە هاوکاری ڕەزا خەندان مەهابادی ئامادەکراوە لە ژێر چاپدایە. ڕۆمانی "همیشه مادر" و کۆمەڵە چیرۆکی "داستانهای تازه داغ" لە ژێر چاپدایە. 6 چیرۆکی دیکەم بۆ منداڵان نووسیوە کە ئیزنی بلاوکردنەوەیان نەداون.

چ شتێك لە ژیاندا دەبێتە هۆی شادمانی و خۆشحاڵی ئێوە؟

لەهەر قوژبنێکی ئەم جیهانەدا هەر چەشنە خەباتێکی چەوساوەکان دژی چەوسێنەران ئەنجام بدرێ ئەمن خۆشحاڵ دەکا. خەباتی خەڵکی ڤەنزوێلا و لابردنی چاوز ئەمنی خۆشحاڵ کرد. کەوتمە یادی ڕاپەڕینی خەڵکی خۆمان لە گەلاوێژی 1331 و گەڕانەوەی دوکتۆر موسەددیق. هەر چەند خەڵکی ئێمە بە هۆی بێ ئاگاییەوە نەیانتوانی لە بەرانبەر کودەتای ئینگلیس-ئەمریکا ڕاوەستن... دڵگران دەبم لەوەی کە کتێبێك سانسۆر دەکرێ و کۆ دەکرێتەوەو نووسەرێك دەخرێتە زیندان و خوێندکارێك زوڵمی لێدەکرێ، ... منداڵانی ئاوارەی سەر شەقام نیگەرانم دەکەن. کاتێك دەبینم لە مێترو یا نێو ماشێنێکدا کەسێك خەریکی خوێندنەوەیە زۆر خۆشحاڵ دەبم.




پێت خۆشە لەسەر کێلی قەبرتان چ ڕستە یا وشەیەك بنووسرێ؟

هەزاران هەزار ئینسانی تێکۆشەر گیانیان لە دەستداو گۆڕەکەشیان بێ سەروشوێنە. بەڵام ناوی ئەوان بۆ هەمیشە لە دڵی ئێمەو نەسڵەکانی داهاتوو لە مێژوویەکدا کە بە دەستی خەڵکی دەنووسرێ دەمێنێتەوە. کەواتە بوونی کێلی قەبر بۆ من هیچ گرنگ نییە. بەڵام ئەگەر ناچارم بکەی کە تەنانەت ڕستەیەکیش بنووسم ئەم ڕستەیەی خوارەوە پێشنیار دەکەم:

"لێرەدا یەکێك لە هاوبیران و هاوکارانی دوو کەس لە تێکۆشەرانی ڕێگای ئازادی ئەندێشە و ڕادەربڕین (محەمەد موختاری و محەممەد جەعفەر پوویەندە) سەری ناوەتە کە تا دواین هەناسە ناوی ئەو دوانەی لەسەر زار بوو."

**سەرچاوە:** پاشکۆی "ئەدەب و هونەر"ی ڕۆژنامەی "کوردستان"ی زمانحاڵی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ژمارە (363)ی 31ی خاکەلێوەی ساڵی 1382ی هەتاوی.

